# کوردو بزووتنەوەی خەواریج

یەکەم ئەزموونی سیاسی ئیسلام لە هەرێمە
کوردییەکانی سنوری خەلافەتدا

ماجد خەلیل

2010

چاپی یەکەم

# کوردو بزووتنەوەی خەواریج لەسەردەمی ئومەوییەکاندا

## یەکەم ئەزموونی سیاسیی ئیسلام لە هەرێمە کوردیەکانی سنووری خەلافەتدا

نووسینی

ماجد خەلیل

# به ناوی خوای تاك‌و ته‌نیا

ناوی كتێب كوردو بزوتنه‌وه‌ی خه‌واریج له‌سه‌رده‌می ئومه‌وییه‌كاندا

نووسه‌ر : ماجد خه‌لیل

تایپ - جوان قاسم

شوێنی چاپ: چوارچرا

نۆبه‌تی چاپ: چاپی یه‌كه‌م ٢٠١٠

تیراژ: ١٠٠٠

نرخ: ٣٠٠٠ دینا

ژماره‌ی سپاردن (٢٦٦٤) ساڵی ٢٠٠٩

## پێرست


دەسپێك ........................................................................ ١٠

بەشی یەکەم: سەرهەڵدانی خەواریج وەك بزووتنەوەیەکی سیاسیو ئایینی................ ١٥

باسی یەکەم : ئاماژەکانی لێکترازان لە ڕیزەکانی دەوڵەتی خەلافەتدا.................... ١٦

باسی دووەم: دەرکەوتنی خەواریج وەك بزووتنەوەیەکی ڕامیاریو ئایینی ................... ٢١

باسی سێ یەم: بیروباوەڕەکانی خەواریجو ڕاڤەی زارلوەکانیان ........................ ٣٧

باسی چوارەم: دەستپێکی جەنگەکانی خەواریج و دەوڵەتی ئیسلامی......................... ٥١

بەشی دووەم : پەیوەندیەکانی کوردو بزووتنەوەکانی خەواریج ........................ ٦٤

باسی یەکەم : سەرنجێك دەربارەی شوێنی جوگرافی هەرێمە کوردیەکان ................. ٦٥

باسی دووەم : دەوڵەتی ئومەویو تێڕوانینیان بۆ ژیانی سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئابوری هەرێمە کوردیەکان .................................................................. ٧٤

باسی سێهەم : خواستی بیروباوەڕەکانی خەواریج لەلای کورد ........................ ٨٤

باسی چوارەم: تایبەتکارەکانی نەتەوەی کوردو ڕۆڵیان لە پەیوەندی بزووتنەوەی خەواریجدا ................................................................................ ٩٠

بەشی سێ یەم : ڕۆڵی کورد لە ڕاپەڕینەکانی خەواریجدا ........................ ١٠٦

باسی یەکەم : کورد لە نێوان لایەنگیری خەلافەت و بزووتنەوەکانی خەواریجدا ............١٠٧

باسی دووەم :کوردو بزووتنەوەکانی خەواریج لە کۆتای سەردەمی ڕاشیدین ..............١١٣

باسی سێهەم : کوردو ڕاپەڕینەکانی خەواریج لە سەردەمی بەهێزیی ئومەویەکاندا ........... ١٢٠

باسی چوارەم : کوردو بزووتنەوەی خەواریج لە کۆتایی دەسەلأتی ئومەوییەکاندا.......... ١٢٤

باسی پێنجەم : ئەنجامو کاریگەرییەکانی کوردو بزووتنەوەی خەواریج.................. ١٤٢

## پێشکەشە بە

رابردووی ژیانمان هەورامانی تەخت، پایتەختی هەموو ناسنامەو جوانیەکانو تایبەتکارەکانی نەتەوەیەك.
بە هەورامان وولاتی چەندینجار کۆلۆنیکراوو دزراو، ولاتی شەبەكو زەنگەنەو زازاکیو زازاییو کاکەییو هەموو ماچۆیەکی رەسەن .
بە خۆم، کە مەحالە پێمبگاتو لە ئەوێکدا بدۆزرێمەوە !

## سوپاس‌و پێزانین

هەریەك لەمامۆستاكانی بەشی مێژووی كۆلێژی زانستە مرۆڤایەتییەكان، دكتۆر شوان عوسمان وەكو سەرپەرشتیاری توێژینەوەكەم‌و دكتۆر حیسامەددین نەقشبەندی‌و دكتۆر ئاراس فەریق زەینەڵ وەك لیژنەی هەڵسەنگاندنی توێژینەوەكە، زۆر سوپاسیان دەكەم، ئەوان بەتێبینییەكانیان توێژینەوەكەیان دەوڵەمەند كرد، هەروەها دكتۆر سەلاح كانەبی لەڕووی پێدانی سەرچاوەی زانستییەوە جێگای خۆیەتی سوپاسی بكەم.

بەڕێز دیاری كاروان‌و جوان قاسم سوپاسیان دەكەم كە هەر لەخۆیانەوە ئەم توێژینەوەیان بۆ تایپكردم، ئەوان‌و كاروان عەبدوللای دیزاینەر نەبوونایە مەگەر بە دەستنووس بڵاوم بكردایەتەوە.

هاوڕێكانی بەشی ناوخۆییم ( ئارام زەینەدین، سەركەوت هادی، عەبدوللا مەلا ئەحمەد، هێمن خورشید، عەفان مەحمود، عەلی حاجی ) ، شەوانە بەدیار چیرۆكە رۆمانسییەكانی ناو زانكۆیانەوە كۆڵێ شكستمان باس دەكرد، هەربۆیە لەوشكستە خۆم دەدزیەوەو درێژەم بە توێژینەوەكە دەدا.

## پێشەکی دکتۆر شوان عوسمان

دەرکەوتنی ئایینی ئیسلام لە کۆمەڵگای نیمچە دوورگەی عەرەبی ، کە تاڕادەیەکی زۆر دوور بوو لە بنەماکانی شارستانییەت، بەشێکی کەمی پێکهاتەو بونیادە شارستانیەکانی مرۆڤایەتی تیادا بەرجەستە دەکرا.

یەکخستنی کۆمەڵگای نیمچە دوورگەی عەرەبی لەچوارچێوەی یەک ئایینو یەک پێشەواو یەک کیانی سیاسیو ئایینی، وەرچەرخانێکی گەورە بوو، بەشێوەیەک دەتوانین بڵێین ئەزموونێکی پێشەنگ بوو لەم کۆمەڵگایەدا نەک لەڕووی ئایینی بەڵکو لەڕووی سیاسیو فەرهەنگیو ئابوورییو کۆمەڵایەتییەوە.

لەسەردەمی دوای قۆناغی پێغەمبەرایەتی، واتە سەردەمی خیلافەتی راشیدی، دیدو تێڕوانینی جیا بۆ دەسەلاتو شەریعەتی دەسەلاتو شرۆڤەکاری بۆ دەقەکانی قورئانی پیرۆزو دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و بنەما ئابوورییەکانو ... تاد. هاتە بەرهەم. بەڵام ئەم شرۆڤەکاریانە بۆ ئەو دیدو بۆچوونە جیاوازانە کەهاتنە پێشەوە، وەنەبێ هەر لەچوارچێوەی جیاوازی لەدیدو تێڕوانینی گفتوگۆو موجادەلە مابێتەوە، بەڵکو چووە قۆناغێکی تر ئەویش قۆناغی گروپبوونو کۆبوونەوەیە لەسەر هاوڕاییو یەکتێڕوانین بۆ لێکدانەوەی دیاردەکانی، یەکێک لەو بوارانە ئایینی ئیسلام ڕێگای پێداوە، دژایەتی کردنی دەسەلاتی زۆردارو ناشەرعییە، ئەم دەرەتانە بووەتە مایەی ئەوەی لەنێوان دژەکان یەکتر بەناشەرعی دابنێنو تێڕوانینیانو بەڵگەی ئایینی بۆ ئەم لایەنە بهێننەوە، یەکتری پێ تاوانبار بکەن.

لەکاتێکدا ئەم لایەنە لە مەودای قسەو جیاواز دەرچوو، گروپی سەربازییو سیاسی لێکەوتۆتەوە، یەکەم گروپیش ئەم لایەنەی گرتبێتە بەر، گروپی خەواریج بوون، کەبەشێك بوون لە لەشکری خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب، دوای رازیبوونی خەلیفە بە پرانسیپی تەحکیم لەگەڵ لەشکری والی شام موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان، لە لەشکرەکەی چوونە دەرەوەو دواتریش

عەبدوللای کوڕی وەهبی ڕاسبییان کردە خەلیفەی خۆیان‌و نازناوی ئەمیری بڕوادارانیان لێنا، دوای ئەوە خەلیفە عەلی هەوڵی فرەی لەگەڵدان تا بەحیوارو گفتوگۆ توانی ژمارەیەکیان بهێنێتەوە نێو ڕیزەکانی، بەلاّم هەر ژمارەیەکیان نەگەڕانەوە، دوواجار خەلیفە چەند هەڵمەتێکی بردە سەریان تا لەنەهرەوان زۆرینەیانی لەنێو بردو ڕێژەی ( ٤٠٠ — ٥٠٠ ) جەنگاوەریان هەڵهاتن‌و ڕوویانکردە ناوچەی شارەزوور.

لەدووای ئەم ڕووداوە ناوچەکانی شارەزوور و هەرێمی جەزیرەو چیاکان بوونە سێ دەڤەری سەرەکی‌و بنکەی دەوڵەتی خەواریج بەدرێژایی سەردەمی خیلافەتی ئومەوی چەندین جوولانەوەو ڕاپەرینیان ئەنجامدا دژی خیلافەتی ئومەوی، بەلاّم ئەوەی جێگای ووردبوونەوەیە ئەوەیە خەواریجەکان لەنێو خۆیاندا چەندین گروپ‌و هاوکات چەندین سەرکردەیان هەبوو، واتە نەبوونی سەرکردایەتییەکی یەکگرتوو، هەروەها بەرنامەو فەلسەفەیەکی یەکگرتوو، بوویە سیمایەکی دیارو بنەرەتی خەواریجەکان، کە ئەمەش دوو هۆکاری گرنگ بوون بۆ سەرنەکەوتن‌و پەرتەوازەیان، شارەزوور جەزیرەو هەرێمی چیاکان سێ دەڤەری گرنگی نیشتمانی کوردان بوون، کەوتبوونە ژێر ڕکێفی فیکری‌و سیاسی خەواریج، ئەوەش وای کردبوو کە کوردیش دوچاری چەندین دیدو فەلسەفەی جیاوازو سەرکردایەتی جیاواز ببن‌و لە شڵەژانێکی فیکری‌و سیاسی بژین لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلام‌و ئایینی ئیسلام، ئەمەش بە هۆکارێکی سەرەکی دادەنرێ، بۆ پەرتەوازە بوونی سیاسی‌و فیکری کورد، لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلام.

هەوڵی نوسەر ( ماجید خەلیل ) هەوڵێکی جدی‌و باشە بۆ دەستنیشانکردنی ئەم لایەنە گرنگانەی سەروو کە باسمانکردن بەشێوەیەکی ئەکادیمی‌و زانستی‌و بەپشتبەستن بەچەندین سەرچاوەو هەروەها شرۆڤە لۆژیکیەکان بۆ لێکدانەوەی ڕوداوەکان. هیوای سەرکەوتن‌و کاری زانستی گەورەتری لێ چاوەڕوان دەکەین.

# دەسپێك

بزووتنەوەی خەواریج وەك بیرێكی سیاسی لەسەرەتای بانگەوازی ئیسلامیو دروستبوونی دەوڵەتی ئیسلامییەوە ئامادیی هەبوو، ئەم بزووتنەوەیە لەكاتو شوێنە جیاوازەكانی سنووری خەلافەتدا لەبەرگو بۆچوونی جیاجیادا خۆی نیشانداوەو بەپێی هەلومەرجو كاردانەوەكان بیری سیاسیانەی خۆیان گەیاندووە، ئەم بزووتنەوە هەنێك جاریش پەرگیرو توندبووەو میتۆدێكی تەكفیری ئاراستەی كردووە، هەندێكاریش دەنگی ڕەخنەو دادی چەوساندنەوەی نەتەوە ژێر دەستەكانی كیانی سیاسی ئیسلامی بووە، زۆر جاریش سەرهەڵدانەكانیان مانادان بووە بەفرەییو ئومەمیەتی ڕاستەقینە بەكردارەكی لەنێو ئەواندا لەدایك بووە، ئەو ئومەمیەتەی لەناوەرۆكی پەیامی ئیسلامدا جاڕی بۆدراو خەلافەتی میراتگری پەیامەكەش بەهۆی تایبەتیكردنی ئیسلام بۆ ئیسلامێكی میللیو چینی سەردەستەو ئەرستۆقرات مراندی. لەبەر ئەوە خەواریج سەرەتاو كۆتاییەكەی بریتی بووە لە بزاڤێكی سیاسیو تووڕە لە دەسەڵاتی سیاسی خەلافەت، ئەگەرچی ئەم بزاڤە لە خوێندنەوەی مێژوو سەرچاوە عەرەبیەكاندا وەك مەزهەبێكی پەرگیر باسی دەكرێتو زیاترخوێندنەوەكان لە ڕێڕەوە مەزهەبیەكەیاندا دەكرێت، بەڵام لەڕاستیدا هەر پەنابردنێكی ئەم گروپە بۆ تێكستو دەقە ئاینییەكان تەنها قەڵغانێك بووە بۆ بیروڕا سیاسیەكانیان، لەبەرئەوە بزووتنەوەی خەواریج لەئاكامی ململانێی نێوان عەلیو موعاویەو كێشەی تەحكیمەوە لەدایك نەبوو، ڕاستە لە پانۆرامای ڕووداوەكانی دوای پێغەمبەردا ئەوان خەملینو لەدایك بوون، وەلێ ئەوان دەرهاویشتەی كاڵبوونەوەی ئەو بەرگە سركەرەی سەردەمی جاهیلی نێوان عەرەبەكان بوون، ئەو بەرگەی نەریتەكانی دەمارگیریو خێڵایەتیو ململانێی

جەنگە نێوخۆییکانی بۆ ماوەیەکی کاتی سڕکردبوو، ئەو بەرگەی سەر لەنوێ لووی ژیانەوەی کردەوە بە پەیکەری بێ ڕۆحی هوبەلو لاتو عوزاو هەزاران بوتی تردا لە شێوەی موعاویەو یەزیدو مەرواندا، کە بەندی بنچینەیی ئیمامەتو شوراو فەرمانڕەوایەتیان گواستەوە بۆ ویراسەتو پشتاو پشت، هەر ئەوانیش ئیسلامیان لە پێشکەوتنخوازیو ئومەمیەت دوورخستەوەو مانای جوانو هێزی فرەییان لێکاڵکردەوە، ئیتر ئەو ئیسلامەی بەنیازو ڕەنجی سوهەیبی ڕۆمیو بیلالی حەبەشیو سەلمانی فارسیو کاوانی کوردیو عەرەبە دەشتەکیەکان تەمای بوو مرۆڤایەتی ڕزگاربکات، کەوتە دەستی پیرێ واعیزو سوڵتان کە نیپۆتیزمو پوڵو کورسیو دونیا خریکردبوونەوەو لەو پێناوەدا لەپێشەوەی هەموو نەیارەکان ڕەمزەکانی بنەماڵەی پێغەمبەریان مل پەراندو وەك ئاردی نێو درکێ پەرتو گومەساریانکردن. هەر بۆیە ئیسلام بەشێوەیەکی گشتی لە دووای خەلیفەکان راشیدینەوە زۆربەی کات خۆی لەنێو بزووتنەوە ڕزگاریخوازیەکانی گەلانی بن دەستدا دیتۆتەوە، نەك لە دەسەلاتی ستەمکارانەی خەلیفەکاندا . چونکە لە دووای پێغەمبەر هێدی هێدی بنەما کلتوریکانی ئەو ژینگە کۆمەلایەتیە لەژێردەستی خەلیفەکاندا زیندووبوونەوە، هەربۆیە خەواریجکانیش دەکرێت دەرهاویشتەی ئەو لادانەی سەردەمی پێغەمبەر بێت کە لەسەر دەستی خەلیفەکانو والیەکان کاری بۆدەکرا.

بزووتنەوەی خەواریج لە سەردەمی ئومەویەکاندا واتای ئومەمیەتی ڕاستەقینەی لەخۆیدا جێبەجێکرد، ئەم بزووتنەوەیە وەك بزافێکی رامیاریو ئایینی لەنێو نەتەوەو گەلانی موسڵمانی ناعەرەبدا پێشوازیەکی جدی لێکرا، خەواریج یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەلاتی سیاسی خەلافەت بوو لەنێو خودی موسڵماناندا، لەونێوەندەدا گەلی کورد دەسپێکی ڕووبەڕووبوونەوەکانی خۆی لەچوارچێوەی ئەم بزووتنەوەیەدا ڕووبەڕووی خەلافەت کردەوە. کورد لەپێش هەموو گەلانەوە دژی دیسپۆتیزمی خەلافەت ڕاپەڕی، نەتەوەی کورد یەکەمین نەتەوەی موسڵمان بوون کە نەیارانی خەلافەتیان لەخۆگرتو

واتایەکی ئینسانیو یەکسانخوازیان دایە بزوتنەوەکەیان، ئەم هەڵوێستەی کوردان لەتەواوی هەرێمەکانیان ئۆپۆزسیۆنێکی سیاسی چالاكو بەهێزی لە رووی خەلافەتدا درووستکرد، بەجۆرێك لەناو عەرەبەکانیشدا بێجگە لە قورەیشیە ئەرستۆقراتە فەرمانڕەواکان هەمووان ئومەمیەتێکی دروستو مانایەکی ئینسانیان دایە پەیامی ئیسلام، لەبەر ئەوە جەنگی خەواریجو خەلافەت جەنگی کلتورەکان بوو، لە هەرشوێنێك کلتوری عەرەبی لەبەرگی خەلافەتو ئیسلامدا ئامادەیی هەبوبێت، کلتورە جیاوازەکانیش نەیارو ئۆپۆزسیۆنی ئەو شوێنە بوون، هەر بۆیە دەبینین کوردان بە لەبەرچاوگرتن تایبەتکارە نەتەوەییەکانیان پێکهاتەی کلتوری خۆیان لە بیری مەزدەکیەتی یەکسانی خوازو زەردەشیەتدا زیندوودەکردەوەو ئیسلامێکی میللی کوردییان قەبووڵ بوو، نەك ئیسلامێك کە بۆنو بەرامەی سیاسەتو بەکارهێنان بداتو رەنگو رووی هۆزو تیرەو نەریتێکی دیاریکراوی بەسەردا زاڵبێت.ئەو مانایەیان دەدایە بزاڤە یاخی بووەکانی خەواریج لە هەر شوێنێکی خەلافەتدا ئامادەییان هەبووبێت، لەبەرئەوە ئەگەر هەر جەنگانێکی کورد لەسەردەمەکانی فتوحاتدا دژی خەلافەت ئامادەیی هەبوبێت، ئەوا نیازی دەسەڵاتی ساسانیەکان ئاراستەی کردووە، یاخود هەر بڕیارێکی ئاشتیو پێشوازیکردنێکی ئیسلام بوونی هەبوو بێت لە پرۆسەی بەئیسلامکردنی ناوچە کوردیەکاندا، ئەوا بێزاری کوردان بووە لەدەسەڵاتی ساسانی، بەڵام مانای ڕووبەڕووبونەوەکان کاتێك بەبایەخە کە ئەزموونی سیاسی خەلافەت لەنێوچە کوردیەکاندا مومارەسەکراوە، ئەگەر نا لە سەرەتاوە کورد خۆی خاوەنی ڕووبەڕوبونەکان نەبووە، بەڵکو ساسانیەکان تەحەکومیانکردووە، لەبەرئەوە لەوکاتەدا بڕیاری ئاشتی، قبوڵکردنی دەسەڵاتێکی سیاسی بوو نەك ئاینێکی نوێ، یاخود جەنگکردنەکانیش دژی دەسەڵاتی سیاسی خەلافەت بووە نەك پەیامەکە، لەبەر ئەوە نەجەنگ کردن بۆ ئێستای کورد نەنگی بووە کە ئێستای ئیسلامخوازەکان بەو جۆرە پێناسەی دەکەن، نە ئاشتی قبوڵکردنی خەلافەتیش مانای پیاهەڵدانو پێشەنگایەتی کوردە بۆ ئیسلام، بەڵام

لەوکاتانەی کەکیانی سیاسی خەلافەت حوکم دەکات و راپەرین سەر هەڵدەدات، ئەو کاتانە راوەستان و لێکدانەوەکان دەستپێدەکات، بایەخی ئەم توێژینەوە لەوەدایە ئایا راپەرینەکانی کورد دژی دەسەڵاتی سیاسی خەلافەت لەکوێی پەیامی ئیسلامیدان، ئەوە رەدکردنەوەی ئەو پەیامەیە یان درێژەدانە بەو پەیامە؟ لەم توێژینەوەیەدا یەکەمین مامەڵەی سیاسیانەی دەسەڵاتی خەلافەت لەتەك کوردان و ناوچەکانیان خراوەتەروو، بایەخی ئەم توێژینەوەیە ئەزموونی کوردانمان پیشاندەدات لەگەڵ یەکەمین نمونەی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی لە نێوچە کوردیەکاندا، هەر بۆیە خستنە رووی ئەم قۆناغە نومایانی سەرەتاکانی کلتورێکە کە بۆ یەکەمجار خراوەتە مێژووی ، ئەمرۆش ئەم کلتورە پێکهاتەی بەرینی ژیانی تاك بەتاکی کوردانە، هەر بۆیە پانۆرامای رووداوەکانی ئەو قۆناغە مەرجی سەرەکی تێگەیشتنێکی زانستیانەی هەموو کوردێکە لەمەڕ مامەڵەکردنەکانی لەتەك پەیام و مێژووی ئیسلامیدا.

ئەم توێژینەوەیە لەچوارچێوەی ناونیشانی ( کوردو بزووتنەوەی خەواریج لەسەردەمی ئومەویەکاندا) دابەشکراوە بۆ سێبەشی سەرەکی" لەبەشی یەکەمدا باس لە دەرکەوتنی خەواریج وەك بزاڤێکی سیاسی و ئایینی کراوە، لەم بەشەدا بەچەند باسێك تەواوی فاکتەرەکانی دەرکەوتن و خەمڵینیان خراوەتەروو، دواتر بیروو راو گروپەکانیان تیشکیان خراوەتە سەر.

بەشی دووەم تایبەتە بە هۆکارەکانی پەیوەندی نێوان کوردان و بزاڤی خەواریج، لەو بەشەدا بەسێ باس فاکتەرەکانی خودی خەواریج و دەسەڵاتی سیاسی ئومەویەکان و پێکهاتەی کلتوری و ئابوری و کۆمەڵایەتی کوردان دەستنیشانکراوە، کە هەریەك لەو سێ رەهەندە مانای پەیوەندیەکان دیاری دەکەن.

بەشی سێهەمیش پەیوەستە بە بەشداری کوردان لە بزووتنەوەکانی دژ بەخەلافەت، لێرەشدا هەموو ئەو راپەرینانەی کوردو خەواریجەکان بەدەرهاویشتەو کارەکانیانەوە خراونەتەروو، دواتریش ئاکام و کاریگەریەکانی ئەم پەیوەندیە بۆ خودی کوردان و دەوڵەتی سیاسی ئومەویەکان خراوەتە روو.

دیاره بۆ نوسینی ئم توێژینەوەیە کەڵك لە سەرچاوە ڕەسەنەکانی ئەو قۆناغە وەرگیراوە، بەتایبەت سەرچاوەکانی" تەبەری، ئیبن کەسیر، ئیبن ئەسیر، مەسعودی، یەعقوبی، بەلازری، ئیبنولجوزی، ئیبنولقەیم، دەینەوەری..هتد، هەروەها لەدیاریکردن شوێنەکانیشدا سود لە کتێبەکانی" صورة الارض، المسالك والممالك، فتوح البلدان"وەرگیراوە، بۆ سود وەرگرتن لە ڕاڤەی بیرو ڕاکانی خەواریجو لێکدانەوەی هۆکارەکانیش کەڵکمان وەرگرتووە لە نوسینی ڕۆژهەڵاتناسانو ناعەرەبەکان تاوەکو زانستی تر ڕاڤەی هۆکارەکان بکەین، بەدەر لەوانەش تەواوی نامە ئەکادیمیەکانی زانکۆکانی موسڵو هەولێرو سلێمانیو بەغداد سودیان لێوەرگیراوە، هەربۆیە پێمان وایە توانیومانە ڕووی درووستی قۆناغەکان مانایەکی زانستی پێبدەین.

سەبارەت بەگرفتەکانی بەردەم ئەم نوسینەش دەتوانین بڵێین پەرتەوازەیی نوسینەکانو نادیاری نوسینە مێژووییەکانی ئەوقۆناغەی مێژووی کورد توێژەر لە دیاریکردنی زانیاری زانستیو بێلایەن ماندوو دەکات، هەرچۆن بێت ئەم نوسینە وەك یەکەمین نوسینی مێژویی لەمەڕ ئەو قۆناغە هەسیارە بەزمانی کوردی دەکرێت بایەخی تایبەتی خۆی هەبێتو شوێنی سەنگینی خۆیبگرێت.

# بەشی یەکەم

# سەرهەڵدانی خەواریج

# وەك بزووتنەوەیەکی سیاسی و ئایینی

## باسی یەکەم :

# ئاماژەکانی لێکترازان لە ڕیزەکانی دەوڵەتی خەلافەتدا

سەردەمی پێغەمبەر (د.خ) تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی دەکات، ڕیزەکانی موسڵمانان بەدەرنەبوون لەسەرپێچیکاران* و دووڕووەکان، وەلێ ئەوکات نەیاندەتوانی بەڕاشکاویی‌و بەئاشکرا ئەوەی لەناخیاندایە نومایانی بکەن[1]، پاش ئەوەی پێغەمبەر (د.خ) کۆچی دوایی دەکات، ئیتر لێرەوە یەکەم ناکۆکی دیار لەسەر مەسەلەی خەلافەت‌و جێگرتنەوەی پێغەمبەر (د.خ) سەرهەڵدەدات، یاخۆ ڕوونتر بڵێین مەسەلەی خەلافەت‌و جێنشینبوونی پێغەمبەر دەبێتە دیارترین پاساوی ناکۆکیەکان‌و لێرەوە هەناوی ئەو کۆمەڵگا تەندرووستەی سەردەمی پێغەمبەر (د.خ)، نەخۆشییەکانی لە شێوەی دیارکەوتنەوەی نیشانەکانی سەردەمی جاهیلی‌و دەمارگیری‌و هەستی پاوانخوازی دەسەڵات‌و گرفتە ئابوریەکانی نیمچە دورگەی عەرەبی سەر هەڵدەداتەوە، سەرەتا گرفتەکان لە دەوری شوێنگرتنەوەی دەسەلات لە دوای پێغەمبەر کۆبوونەوە، ئەوانەی نوێنەرایەتی بۆچوونە جیاوازەکانیان دەکرد لەسەر مەسەلەی جێگەگرتنەوەی پێغەمبەر بریتی بوون لەم گروپانە:

١ – کۆمەڵێك وایان دەبینی پێویستە خەلیفەو شوێنگرەوەی پێغەمبەر(د.خ) لە بنەماڵەی پێغەمبەر بێت‌و کەسێك بێت لەوان.

٢– کۆمەڵێکی تر ئەو مافەیان لە پشتیوانەکانی شاری مەدینەدا دەبینیەوە.

ئیتر لە چوارچێوەی ئەم دوو گروپەدا زەمینەکانی ناکۆکی چەکەرە دەکات‌و کەشێکی بەهاری بۆ سەوز بوونی چەندەها گروپ‌و هۆزو ئایدیای جیاجیا لە

ماوەکانی تردا دەڕەخسێت، بە جۆرێك پیاوانی موژە پێدراوی بەهەشتو پایە سەرەکیەکانی بانگەوازی ئیسلامیی و خودی بنەماڵەی پێغەمبەر (د.خ) دەبنە جەمسەرێکی ململانێکان و واقیعی دونیاگەرایی و سیاسەت شوێنی بۆ قیامەت ژیان و بۆخوا ژیان تەسك و تەریك دەکات.
دیارە لە پاش کۆچی پێغەمبەر، بەشێوەیەکی گشتی و لەگەڵ بوونی هەندێ ناکۆکیدا موسڵمانان بەگشتی بەڵێنیان بە ئەبوبەکری سدیق دا [۲]، ئەم بەڵێندانە لەکاتێکدا بوو عەباسی کوڕی عەبدولموتەلیبی مامی پێغەمبەر لەسەرەتای ململانێکاندا دەیەویست کاروباری خەلافەت لەدەستی بنەماڵەی و نەوەی هاشمدا بێت، تەنانەت لەکاتی خراپبوونی ڕەوشی تەندروستی پێغەمبەر(د.خ)، دەستی عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەگرێت و پێی دەڵێت: "بەخوا تاچەند ڕۆژێکی تر تۆ جێنشینی پێغەمبەریت"[۳] هەروەها پشتیوانەکانیش (الانصار) کاتێك پێغەمبەر کۆچی دوایی دەکات، ئەوان هەموویان لەکەپری (بنی ساعدە) لەدەوری سەعدی کوڕی عوبادەی دەمڕاستیان خڕدەبنەوەو بەکۆچ کردووەکان ڕادەگەیەنن:" لەدوای سوپاس و ستایشی خودا، دەمانەوێ بڵێین ئێمەین پشتیوانی خواو بەشی هەرە زۆری سوپای ئیسلام، ئێوەیش ئەی کۆچك کەران دەستەو کۆمەڵێکن لەئێمە، بەڵام ئێوە هاتوون دەتانەوێ مافمان داگیر بکەن و لەکاروباری خەلافەت پشتگوێمان بخەن"[٤]. هاوکات سەرەڕای بوونی ئەم وردە ناکۆکیانەش زۆرینەی عەرەبە سەحرانشینەکانی دوورگەی عەرەبیش دەستیان کرد بە هەڵگەڕانەوەو ئیتر ملیان بۆ خواستەکانی دەوڵەتی خەلافەت لەمەدینەدا نەدا، بەجۆرێك موحەمەدی کوڕی ئیسحاق ئاماژەی پێدەکات و دەڵێ: "لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ) جگە لە دانیشتوانی مەککەو مەدینە هەموو عەرەب لەئاینی ئیسلام پاشگەزبوونەوە، لەوانەش هۆزەکانی ئەسەدو غەتفان و کیندەو ڕەبیعەو تەمیم و هتد"[٥]. لەلایەکیترەوە لەدۆخێکی وەهاشدا هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی خەلافەت و بۆچوونەکانی هاوەڵانی پێغەمبەر بۆ چارەسەری ئەوگرفت و مەترسیانە لێك دوورو جیاواز بوو، بەجۆرێك هێندەی نەمابوو بگاتە

ڕادەی لێکترازان. تا لەئاکامدا ئەبوبەکری سدیق بڕیارێکی مێژووی دەداتو دەڵێ:" بەخوا ئەگەر بزنێک یا ئەو گوریسەی کە وشتری زەکاتی پێدەبەسترێتەوە، بەمنی نەدەن هەروەک دەیانهێنا بۆ پێغەمبەر(د.خ)، ئەوا لەگەڵیان دەجەنگێمو دەجەنگم لەگەڵ کەسانێک جیاوازی دەخەنە نێوان زەکاتو نوێژ"٦. هەروەها دەتوانین دەسپێکی تری جیاوازیەکان لەسەر ناردنی سوپاکەی ئوسامەی کوڕی زەید بۆ شام بخەینە ڕوو، چونکە هەندێك لەلایان وابوو ئەو سوپایە خاستر وایە دەرنەچێتو لەمەدینەدا بمێنێتەوە بۆ ڕووبەڕووبونەوەی هەڵگەڕاوەکان، وەلێ سەبارەت بەم گرفتەش ئەبوبەکر ڕایگەیاند: "سوپایەك ناوەستێت لەکاتێکدا پێغەمبەر (د.خ) بەڕێی خستووە"[٧]. لە ڕاستیدا تا ئەوکاتە کاریگەریەکانی مۆڕاڵی پێغەمبەر(د.خ) زیندوو بوونو بڕیارە یەکلاکەرەوەکانی ئەبوبەکر بەربەستی بەردەم جیاوازیەکان بوون، بە جۆرێك لەسەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی خەتابدا( ١٣-٢٣ك / ٦٣٤-٦٤٣ ز) تەواوی ناکۆکیەکان بەرەو نەمانو کەمی چوون، چونکە عومەر لە پرۆژە دادگەریەکەیدا بەردەوام هێزو فشاری توندی بۆ هەر نەیاریەو باوێکی مەترسیدار لەپێشچاوگرتبوو. بەمجۆرە لەو ماوە کورتەدا لەسەردەستی موجاهیدو زانایان خەڵکی بەلێشاو* موسڵمان دەبوون، ئیتر ئەو سەردەمە سەردەمی فراوانخوازی سنوورەکانی خەلافەتو فتوحاتەکانی ڕۆژهەلاتو ڕۆژئاوا بوو٨. بەلام بەتیرۆرکردنی خەلیفەی دووەمو دەسەلات گرتنەدەستی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەففان ( ٢٣-٣٥ك / ٦٤٣-٦٥٥ز)، سەردەمێکی نوێو گۆڕانێکی نوێ لەڕامیاری دەرەوەی خەلافەتدا هاتە گۆڕێ، چونکە لەبەرامبەر هێزی ئەو کاتەی دەوڵەتدا نەیارانی خەلافەت چەکێکی نوێیان بەکارهێنا، ئەویش چەکی ناکۆکی خستنە ناو موسڵمانان بوو٩، چونکە لەوکاتەدا زەمینەی لێکترازانو پاساوی جوداخوازی لەمامەڵەی ڕامیاریانەی خەلیفەی سێهەمدا ئاسانکاری بۆ کرابوو، تا لەچوارچێوەی مەکرو پلانەکانیاندا خۆشەویستی عوسمانی کوڕی عەففان بۆ بنەماڵەی ئومەویو چۆنیەتی دابەشکردنی سامانو دابەشکردنی زەوی بەسەر خزمەکانیانداو

بوونی نزیکەکانی بنەماڵەکەی بەکاربەدەست و گۆڕینی هاوەڵە یەکەمینەکانی ئیسلام بۆ نزیکەکانی خۆیو دانانیان لەپۆستە باڵاکاندا باشترین پاساوی تێکدەرانەی دابە دەستی نەیاران،. سەرەتاش دانانی خزمەکانی بەوالی هەرێمەکانی خەلافەت کرایە بەڵگەیەکی زیندوو بۆ دژایەتیکردنی عوسمان، لەکۆتایشدا لەچوارچێوەی نەخشەو پلانەکانیاندا بەئاشکرا تیرۆریان کردو شەهید بوو. لێرەوە گەمەی مەهامە سیاسیەکان گەرمتر دەبێت، هەربۆیە شەهیدکردنی خەلیفە عوسمان خاڵی ناکۆکیو ئاژاوەکانی قوڵترکرد کردەوە١٠، لەدوای عوسمان، عەلی کوڕی ئەبوتالیب( ٣٥-٤٠-ك ٦٥٥-٦٦٠.ز)، لەلایەن زۆرینەی موسڵمانانەوە هەڵبژێردراو کرایە خەلیفە. وەلێ لە سەر وەختی ئەم خەلیفەیەشدا لەسەر کێشەی سەندنی خوێنی عوسمان، موسڵمانان بەشێوەیەکی گشتی لەگوێ ڕایەڵی کردنیدا دابەش بوون بۆ دووبەرە، بەرەیەکیان داوای دەکرد تۆڵەی خوێنی عوسمان گورج و بە زوویی بسێنرێت، ئەم بەرەیە ئەوانە بوون کە لەفەرمانی عەلی دەرچوون، ئەوانیش بریتی بوون لە عائیشەی خێزانی پێغەمبەرو تەڵحەی کوڕی عوبەیدوڵلاو زوبەیری کوڕی عەووام١١، ئەوان سەرداروسەرکردەی دەرچووانی بەرەی دژ بە عەلی بوون، ئەمانە بەهاوبەشی یەکتری سوپایەکیان ڕێکخست بۆ نەیاری خەلیفە، تا کار گەیشتە ئەوەی لەجەنگی ناسراو بە جەمەل دا ( ٣٦ك/ ٦٥٦ز) * ڕووبەڕووی یەکتربونەوەو لەئاکامدا لەبەردەم سوپای خەلیفەدا تێکشکان.

لە راستیدا ئەم جەنگە برینێکی قوڵو کلتورێکی ترسناکی سەردەمی جاهلی زیندووکردەوە، بە جۆرێك ئیبن خەلدون پێی وایە ڕشتنی خوێنی یەکتری لە سەر کورسیو دەسەڵات ئەنجامی ئەو پێکدادانانە بوو کە ڕیشەیەکی کولتوریو بۆماوەیی هەبوو لەنێو عەرەبەکاندا، ڕۆژهەڵات ناسانیش ئەم جەنگە وەك پەڵەیەکی ڕەش لە مێژووی یەکەمینەکانی ئیسلام باس دەکەن، کە هیچ وەك یەکیەك لەنێوان ئەم مێژووەو خودی پەیامەکەدا نیە تاوەکو بانگەشەی موماملەرەسەکردنی بکرێت.

دواتریش هەر لەسەر ناكۆكییەكانی سەندنەوەی خوێنی عوسماندا موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیانی ئامۆزای سوپایەكی لەخەڵكی شام كۆكردەوەو بڕیاریدا لە ژێر سایەو پەرچەمی خەلافەت دەربازبێت*، ئەوەبوو ئەویش لەژێر ناوی خوازیارانی خوێنی عوسمان خۆی بۆ جەنگ ئامادەكرد، لەبەرامبەریشدا خەلیفە عەلی سوپایەكی ڕێكخست بۆ هێنانەوەی موعاویەو خەڵكی شام بۆ ژێر سایەی خەلافەت، سەر ئەنجام لەجەنگی سەفین دا*، هەرچەندە خەلیفە سەركەوت، بەڵام بەگرتنەبەری سیاسەتو مەكری سیاسی، موعاویە داوای ناوبژیوانی كرد١٢، ئەم ناو بژیوانیكردنە یەكەم زەمینەی ڕەخساو بوو بۆ ئاشكراكردنی بانگەوازو بزافی خەواریج، كە بەهۆی چەندین هۆكاری پێشینەوە بەتەواوی خەمڵیبوونو ئیتر كاتی ئەوە هاتبوو خۆیان ڕابگەیەنن.

## باسی دووهم:

# زهمینهی دهرکهوتنی خهواریج
# وهك بزووتنهوهیهكی ڕامیاریو ئایینی

دهركهوتنی خهواریج وهك بزووتنهوهیهكی ڕامیاریو پاشان ئایینی تهنها پهیوهست نیه بهكێشهی پێشهوایهتی (الامامة)ه وه، ئهو كێشهیهی كهململانێیهكی قولّو جهنگێكی خوێناوی قولّی تێكهلّ بهمێژووی موسلّمانانو كیانی سیاسی دهولّهتكرد.

دیاره سهرههلّدانی ئهم هێزه بهرههمی كۆمهلّێ هۆكاره، بهجۆرێك وهكو ڕهوتێكی ڕامیاریو ئایینی لهو قۆناغه مێژووییهدا خۆی نومایانكرد لێرهدا ئاماژه به گرنگترین هۆكارهكانی دهركهوتنیان دهدهین.

## یەکەم: لادان و بەرهەڵستیەکانی سەردەمی پێغەمبەر(د.خ)

گێڕانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کەهەندێك ڕووداوی سەردەمەکەی خۆی سەرەتاکانی دەرکەوتنی ئەو بزووتنەوەیەن١٣. هاوکات زۆرێك لەسەرچاوەکانیش هەوڵیانداوە سەرەتای دەرکەوتنی ئەو تێزە فیکریو سیاسیە بگێڕنەوە بۆ سەردەمی ناوبراو١٤. لەبەرئەوە دەکرێت یەکەم نیشانەی ئەم هزرە مەترسیدارەی سەر قەوارەی یەکێتی ئیسلامیی بگەڕێتەوە بۆ ڕەهەندە بەرهەڵستکاریەکانی سەروبەندی ژیانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(د.خ)، ئیتر لەوێوەو لەسەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین ناکۆکیەکان تەشەنە دەکەنو زلدەکرێن، بەشێوەیەك لەسەردەمی خەلیفەی سێهەم بەرهەڵستکاریەکان خۆیان وەك قەوارەیەکی دژی یەکێتی نەتەوەکان ڕادەنوێنن، بەرادەیەك گەیشتنە ئەوەی کە لەسەردەمی عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا یاخی بوونو سەنگەرگرتن دەستپێکردو لە دەرهاویشتەکانی جەنگی سەفینیشدا بەئاشکرا جیابوونەوە ڕوویدا١٥.

سەبارەت بەلادانەکانی سەردەمی پێغەمبەریش ئەوا هەر لەئاماژەکانی پێغەمبەرەوە دیاردە گەلێك ڕەوتی لادانەکان دیاریدەکات، گرنگترین ئاماژەش فەرمودەیەکە کە هەریەك لەپێشەوایانی فەرموودە لەئەبو سەعیدەوە هێناویانە، سەرەتا بوخاری گێڕاویەتەوە: " کاتێك پێغەمبەر (د.خ) دەسکەوتەکانی جەنگی حونەینی دابەشکرد زولخوەیسیرەی تەمیمی هاتو وتی: پێغەمبەری خودا دادپەروەربە، پێغەمبەریش(د.خ) فەرمووی هاوار بۆ تۆ، ئەگەر من دادپەروەر نەبم کێ دادپەروەرە ؟ لەم کاتەدا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی ئەی پێغەمبەر (د.خ) ڕێگەم بدە تا لە ئەستۆی بدەم؟، ئەویش فەرمووی، نا لێی گەڕێ، بەخوا لە پشتی ئەم پیاوە کەسانێك دروست دەبن نوێژوو ڕۆژووی ئێمە لە چاویاندا کەمە، بەڵام ئەوانە لەدین دەردەچن، هەروەك چۆن تیرێك لەکەوانێك دەردەچێت، لەپێشو دووای

خۆشیان هیچ نابینن"١٦. بەپێی ئاماژەکان ئەو پیاوە زولخوەیسیرەیەو لەهۆزی سەحرانشینی تەمیمە١٧. جگە لەمە پێشەوایان موسلیمو بوخاری لەزۆر شوێندا بەگێڕانەوەی جیاواز باسی زولخوەیسیرە دەکەنو باسی ئەوە دەکەن کە لەنەوەی ئەم کەسایەتیە نەتەوەیەك درووست دەبن کە لەدیندا زۆر رۆدەچن، هەروەها قورئان هێندە بەساردی دەخوێنن، کە ناگاتە گەروویان١٨، لەبەرئەوە سەرچاوەکان ئەم پیاوە بەیەکەم کەس دادەنێن کە پێیانوایە خەواریج لەوەوە دەستپێ بکات، هەر ئەو سەرچاوانە ناوی تەواویشی بەحەرقوسی کوڕی زوهەیری سەعدی دەبەن١٩. هەروەها ئەم کەسە ئەوەی لەبارەی نیشانەکانی لەشو لاریەوە دەوترێت، ئەوەسە کەپەنجە توتەی کوڵ بووە، یان دەوترێت مەمکدار بووە. بۆ نمونە خەلیفە عەلی بەئاماژە بەفەرمودەکانی پێغەمبەر(د.خ) لایەنگرانی خۆی لە تایبەتمەندیو سیمای خەواریجەکان ئاگادارکردووەتەوەو فەرمویەتی: "کۆمەڵێك پەیدا دەبن ملکەچ ناکەن، چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت ئەوانیش ئاوا لەئایین دەردەچن، نیشانەی ئەم کۆمەڵەیەش ئەوەیە کە سەرکردەکەیان پەنجە تووتەی کوڵە"٢٠. هەروەها دەوترێت پێغەمبەر فەرموویەتی نیشانەی ئەو کۆمەڵەیەی کە دەردەچن سەرکردەکەیان پیاوێکی ڕەشەو یەکێك لە دەستەکانی وێنەی مەمکی ئافرەتە یا وێنەی پارچە گۆشتێکەو دەلەرێتەوە، لەکاتێکیشدا پەیدا دەبن کە ڕیزی موسڵمانانو کیانی سیاسیی ئیسلامیی پەرتەوازەن. هەروەها ئەبو سەعیدی خودری* دەڵێ:" من شایەتی دەدەم ئەو ناساندنەی زولخوەیسیرەم لە پێغەمبەری خودا بیست، هەروەها شایەتیش دەدەم کاتێ عەلی ئەوانەی کوشت، لەوێندەر ئامادەبووم، ئەوکات تەرمی ئەو پیاوەیان هێنا، کە هەمان وەسفو سیفەتی تیادابوو کەپێغەمبەر(د.خ) باسی کردبوو٢١. هەروەها لە گێڕانەوەیەکی تردا دەڵێت پێغەمبەر فەرموویەتی: "(تمرق مارقە عند فرقە من المسلمین یقتلها اولی الگائفتین بالحق" لەرێ دەرچووان، کاتێك لەرێ دەردەچن موسڵمانان لە پەرتەوازەییدان، نزیکترین یەك لەو دوو دەستەیەی لە ڕاستییەوە نزیکە، شەڕیان لەگەڵ دەکەن"٢٢. بەمجۆرە بەو

بەلگانەی سەرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە حەرقوس بەیەکەم کەس دادەنرێت لە دامەزرێنەرانی بیری خەواریج، چونکە ئەم کەسایەتیە ڕۆڵی بینی لەیەکەم سنوور شکاندن لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) ٢٣، هەروەها یەکێك بوو لەوانەش کە دژی سیاسەتی خەلیفە عوسمان بوو، تەنانەت بوو بە نوێنەری هەلگەڕاوەکانی بەسرەو دەرچوو بۆ مەدینە بۆ کوشتنی خەلیفە عوسمان٢٤. هەروەها لەجەنگی سەفیندا لەناو سوپای عەلیدا بوو، یەکێکیش بوو لەو گروپەی لەسەر مەسەلەی ناوبژیکردن لەڕیزی عەلی جیابوونەوە و لەگەلّ خەواریجەکان دەربازی کوفەو نەهرەوان بوو٢٥. تا دواجار لە جەنگی نەهرەواندا لەنێو ئۆردووی کوژراوەکاندا دۆزرایەوەو لاشەکەی لەمەیدانی جەنگیّ کەوتبوو. لەم کاتەدا عەلی بەپشتبەستن بە زانیاریەکانی پێشوەختی پێغەمبەر لەناو کوژراوەکاندا گەڕا تاوەکو دۆزییەوە. سەرچاوەکان دەلّێن کاتێك عەلی تەرمی حەرقوسی دۆزییەوە مژدەی کوژرانەکەی دا بەشوێنکەوتوانیو کڕنوشی برد بۆ خودای تاقانە، پاشان ووتی :" پێغەمبەری خودا ڕاستی فەرموو". لەوکاتەدا یەکێك لەهاوەلآن پرسیاری لەخەلیفە کرد، ئایا لەپێغەمبەرت بیستووە حەرقوس لەم بەرەیەدا دەکوژرێت ؟ عەلی لەوەلآمدا فەرمووی: بەوخوایەی کە جگە لەخۆی پەرستراویتر نیە، لەپێغەمبەرم بیستووە"٢٦. بەم جۆرە لە دەرهاویشتەی ئەم ڕووداوانەدا دەگەینە ئەو ئاکامەی، کە بەلّێ لەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا نایارانی بانگەوازو پەیامی ئیسلام شێوازی دژایەتییان تەنها لەجەنگی بەرەییدا نەبوو، هەروەکو چۆن لەسەرەتای بانگەوازدا قورەیشیەکانو خزمە نزیکەکانی پێغەمبەر(د.خ) ئەو ڕێگایەیان گرتەبەر، بەلّکو کەسانێك لەدەورو پشتی پێغەمبەر ئامادەبوونو خواستی دژایەتیان بەنهێنی پیادەدەکرد، ئەوان لەو عەرەبە دەشتەکیو کۆچەرانەبوون، کە بڕوای تەواویان بەبەلگەکانی پێغەمبەر (د.خ) نەبوو، یاخود کەسانی نزیکی خۆی بوون کە نەیاندەتوانی لەبەرامبەر هەیمەنەو دەسەلآتی کاریزمی پێغەمبەر(د.خ) ملکەچی خواستەکانی نەبن، هەروەکو چۆن زۆرێك لەوانە تا دوا ساتی زالّبوونی پێغەمبەرو فەتحی مەککە

دژایەتیان کردو پاشان بەناچاری تەسلیمی لێخۆشبوونەکەی پێغەمبەر بوون، ئەمانە هەموو ئەو یارانەی پێغەمبەر بوون کە لەگەڵ بچوکترین دەرفەتو بۆشایی خۆ زیندووکردنەوەدا مەیلی زەعامەتو ئەرستۆقراتیەتی ڕابردوو دەکەوتەوە مێشکیان، هەربۆیە لەم ڕێڕەوەداو لەگەڵ دوورکەوتنەوەی زیاتری زەمەنیی لەسەردەمی پێغەمبەر (د.خ) ماوەی لێکترازانەکانیش زیاتر دەردەکەوتن‌و پەردەی مەبەستە شارراوەکانی دەورو بەرەکەش خێراتر هەڵدەدرایەوە. یاخۆ پێمان وایە بڕیاری لێخۆشبوونی پێغەمبەر بۆ ئەبووسوفیان لەکاتی فەتحی مەکەدا بڕیاریی سازشکردنی ئیسلام بوو لەتەك نەریتە کۆنەکان‌و تایبەتمەندی‌و عورفی عەرەبی‌و قورەیش، چونکە ئەوان بەبێ خاوەنداریەتی بوونی جۆرێك لەپلەو پایە ئامادەنەبوون دەست لە پێگەی ڕابردوویان بەربدەن، وەلێ ئەم سازشە لەسەر حسابی ئەسڵ‌و فەرعی ئایینەکە نەبوو، بەڵکو سیاسەتی دەڵەتداریّتی ئیسلام حەوجێ بە جۆرێك لە دیپلۆماسیەت هەبوو بۆ خڕکردنەوەی ئەو خەڵکانەی کەمیراتگری سەروەری‌و کورسی‌و پۆستەکانی هۆزایەتی نێوچەکە بوون.

دووەم: دەمارگیری هۆزایەتی‌و کاریگەری لەسەر دەرکەوتنیی بیری خەواریج

لە پێش ئیسلامدا عەرەبەکانی بادیەو نیمچە دوورگەی عەرەبی ڕوویەکی دیاری ململانێکانیان لە ژیانی کۆمەڵایەتیاندا بریتی بوو لە تایبەتمەندیەکانی ژیانی هۆزایەتی، لەبەر ئەوە دەکرێ بڵێین ململانێکانی ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییە فاکتەری زۆرینەی کوشت‌و بڕی نێوخۆییان بوو، چونکە هەمیشە لەو ژیانەدا لە هەوڵی ماناداان بوون بە شانازی‌و سەرکەوتن‌و زاڵبوون بەسەر هۆزی ئەوی تردا، ئەوان بەردەوام شانازییان بە هۆزەکانیانەوە دەکردوو توندڕەوانە بەرگریان لێدەکرد٢٧. توندڕەوی‌و دەمارگیری عەرەب شتێك بوو قابیلی فەرامۆشکردن‌و سڕینەوە نەبوو، یا خۆ ئەوەی ئیسلام بەوانی کرد، سڕبوونێکی کاتی‌و شاردنەوەیەکی کورت بوو، ئیتر دەبوو جارێکی تر

ڕووداوەکانی داحس و جەنگەکانی ئەوس و خەزرەج لە بەرگی جەمەل و سەفیندا دووبارە بکەنەوە. ڕاستە بە هاتنی ئیسلام، ئەم پەیامە نوێیە ئەوانی ڕاهێنا بەنەمانی دەمارگیری*، چونکە لەو پەیامەدا مرۆڤەکان فێردەکران یەکسان بن و هیچ گەل و هۆزێك لەوی تر بالاّ نەبوو۲۸، بەڵکو بالاّ بوون بەسترابوو بە باوەڕداری و بەندایەتییەوە، بەم جۆرە بیروباوەڕی ئیسلامی هەوڵێك بوو بۆسڕینەوەی بیرووباوەڕی هۆز پەرستی و گواستنەوەی بیرو باوەڕو پەیامێکی مرۆڤانە بۆ چوارچێوەی تێکڕای گەل و نەتەوەکان، چونکە پەیامی ئیسلام لەبنەڕەتەوە پەیوەندی خێڵەکی عەرەبی دەگۆڕی و هەوڵی دەدا لەو کێشە ناوخۆیانەی کەسنوور تەسکی و کەم دەرامەتی و لاوازی ئابووری نیمچە دوورگەی عەرەبی درووستی کردووە ڕزگاریان بکات۲۹، هەربۆیە فتوحاتی ئیسلامی هەوڵێك بوو بۆ فراوان کردنی ڕووبەری جوگرافی و کەم کردنەوەی کێشە ناوخۆییەکانی ناو خێڵە عەرەبییەکان ۳۰، بەلاّم لەگەڵ بوونی گوتارێکی لەم جۆرەی ئیسلامدا عەرەبە دەشتەکییەکان تەنها بەرگی ڕواڵەتی ئیسلامیان پۆشی بوو، ئەوان لەناخەوە بەر پرسیارەتی کرداری ئەو پەیامەیان هەڵنەگرت ۳۱، خودای گەورەش ئەم ڕاستییە باس دەکات و دەفەرموێت ( الا عراب ا شد کفرا ونفاقا)* ۳۲.

سەبارەت بەڕاستی ئەو بۆ چوونەمان چەندین نمونەی مێژوویی ئەوە دەسەلمێنن، دیار ترینیان هۆزی گەورەی بیابان نشینی بەنوحەنیفە بوون، ئەوان خۆیان ڕێکخست بۆ بەرگری لە هۆزەکەیان و بڕوایان بە موسەیلەمەی درۆزن* هێنا، ئەم هۆزە گەورەی بادیەی عەرەبی لەناسکترین کاتی ڕەوشی ئالۆزی کیانی سیاسی ئیسلامدا گەورەترین بزاڤی هەڵگەڕانەوەیان دژی ئەوکیانە و کۆڵەکە ئابوریەکەی ڕاگەیاند، کەخۆی لە نەدانی زەکات و بانگەشەکردن بۆ پێغەمبەرایەتی و بردنی پیرۆزیەکانی دین دەبینیەوە، ئەوان ڕایانگەیاند دژی قوریش و بڕیاری نەدانی زەکاتیان دا. تەنانەت ئەم شێوازە بوو بە نەریتێك و بیرێکی سیاسی باو، کە دواتر دەرەوەی دوورگەی عەرەبیشی گرتەوە۳۳. ئەوەی یارمەتیدەری ئەم بیرە سیاسیە بوو ڕەنگدانەوەی

دەمارگیری‌و هەستی خۆ بە جیاواز زانینی قورەیشیەکان بوو، کە تەواوی نەتەوەو هۆزو کلتورە جیاوازەکانی زۆربەی کات لەسەنگەرێکدا مۆڵدەدا دژ بە ئەرستۆقراتیەتی قورەیش‌و هەر بەناوی پەیامی ئیسلام‌و زانیاریەکانیەوە بزاڤەکەشیان جۆشپێدەدا. ئەمەش هەوانتەوە هەر لەخۆوە نەبوو، چونکە قورەیشییەکان وەك چینێکی سەردەستەو ئەرستۆکرات بەرەبەرە لەخۆبایی دەبوون‌و دونیاگەرایی ڕووی لێ کردبوون، ئەوان وا گومانیان دەبرد زەوی ئیسلام تەنها موڵکی خۆیانە، بۆنموونە سەعدی کوڕی وەقاس، نزیکترین هاوەڵی پێغەمبەر، کە ئەو دەمانە والی کوفە بوو، ئەوەی لەبارەیەوە دەگێڕنەوە یەکێك بووە لە والییە دڵسۆزەکانی دەوڵەتی مەدینە، بەڵام هەڵوێستێکی ئەو پیاوە جێگەی تێڕامانە کە دەیوت بە ئەهلی ڕەشە خاك کەمەبەستی ئەهلی عێراقە: " زەویەکانیان هەمووی موڵکی قورەیشە"٣٤. ڕەنگە وتەی ئەم والیە لەواقیعی باڵادەستی قورەیشیەکانەوە سەرچاوەی گرتبێت، بەجۆرێك ئاسایی بووە والیەکی نیەتپاك‌و دڵسۆزی خەڵك، هەستێکی دەمارگیریانەی لەوجۆرە دەربڕێت، ئاخۆ والیەکانی دی کە هەوڵی کورسی‌و ململانێی هۆزایەتی باڵادەستی کردبوون چ گوتارێکی ئازار دەروو چی پەیامێکی پێچەوانەی ئیسلامیان گەیاندبێت؟، بەمجۆرە ئەرستۆکراتییەتی قورەیش‌و نیپۆتیزمی سەردارەکانیان لە هەموو بەرەیەك زیاتر کەڵکی وەرگرت٣٥. ئەمەش زەمینەیەك بوو ڕاستەوخۆ کاریگەری بەجێ هێشت لەسەر دەرکەوتنی خەواریج. دیارترینی ئەم بەڵگەیەشمان کە پاڵنەری هۆزایەتی دەکاتە پێوەر بۆ سەرهەڵدانی گرووپی خەواریج، بریتییە لەو ڕووداوەی، لەکاتێکدا دەیانویست نوێنەرێك دیاری بکەن بۆ ناوبژی کردن لەناو سوپای خەلیفە عەلی دا ڕوویدا، ئەوەبوو زۆرێك لە هۆزەکانی عەرەب ڕازی نەبوون عەبدوڵلای کوڕی عەباس* نوێنەری خەلیفە عەلی بێت، چونکە زۆربەی سوپاکەی عەلی لەبیابان نشینەکان بوون‌و هۆزگەرا بوون، مادامەکێ عەبدوڵلای کوڕی عەباس لە بنەماڵەی خەلیفەیە، خواستی ئەوە لەکەللەیدان ئەبو موسای ئەشعەری ببێت بە نوێنەر بۆ ناو بژیکردن، ئیتر بۆ دواجار خەلیفە زۆری

لێکراو ئەبوموسا کرایە نوێنەر٣٦. بەمجۆرە سوپاکەش بەناچاری ڕازی بوون بەنوێنەرایەتی ئەبو موسای ئەشعەری، تەنها لەبەر ئەوەی قورەیشی نەبوو٣٧. ڕۆژهەلاتناسان زۆرتر ئەم دیاردەیە بەرچاو دەخەن، لەوانە لێکۆڵەری فەرەنسی (دیمۆمبین )ە کەدەڵێ: "بوونی زۆرێك لە هۆزەکانو ژمارەیەکی زۆری مەوالی لەڕیزەکانی خەواریج دەرئەنجامی بانگەوازی یەکسانی خوازی ئەو تاقمە بوو"، چونکە هەمویان کوکبوون دژی گەماڕۆدانی خەلافەت لەلایەن قوریشییەکانەوە* ٣٨. هەرئەمەش بوو زۆربەی هۆزەکانی ماندا بەتایبەتی هۆزی گەورەی تەمیم کە یارمەتی خەواریج بدەنو گەورەترین نرخ بە پێکهاتەی عەقڵیو مرۆیی ئەو هێزە بدەن ٣٩. بەجۆرێك زۆرێك لەسەربازو سەرکردەکانیان لەهۆزی ئەوان بوون، تەنانەت ووتراوە:" بزووتنەوەی خەواریج لە ئامێزی بەنو تەمیمو لەژێر ئاڵای ئەو هۆزەدا گەشەی کردو لەدایك بوو"، هەروەك چۆن سەرکردە یەکەمینەکانیشیان هەموویان لەهۆزی تەمیم بوون، لەوانە حەرقوسی کوڕی زوهەیری سەعدی، مەسعەری تەمیمی، عروەی کوڕی ئەدیەی تەمیمیو براکەی مەرداس٤٠ ، هەموویان لەو هۆزە بوون. بەدەر لەهۆزی تەمیم لە هۆزەکانی تریش سەرکردەی دیار هەبوون، لەوانە سەرکردە پێشینەکانی وەك ( عەبدوللای کوڕی کەوای یەشکری، موعازی کوڕی جووەینی تایی، عەبدوللای کوڕی وەهبی ڕاسبی)، ئەمانە گشتیان لە هۆزە جیاوازەکانی عەرەب بوون. کەواتە پێکهاتەیەکی هۆزگەرایی لەو جۆرە لەناو ڕیزەکانی خەواریجدا ئەوە دەسەلمێنێ کە دەرچوونی ئەو گروپە پاڵنەرێکی هۆزایەتی لەپشتەوە بووە، پاڵنەرێك کە فشارەکانی لە هەیمەنەو لوتە لایی قوریشیەکانەوە وەرگرتبوو لە بەرانبەر پەرێز خستنی ئەواندا لە بەشداری سیاسیدا، هەربۆیە لەماوەی قۆناغێکی دوورو درێژ لە مێژووی خەواریجدا، تەنها قوریشییەك لە ڕیزەکانیان نابینرێت٤١، لەکاتێکدا خەواریج هیچ کاتێك لەدەمارگیرییان دژی قورەیش نەوەستاوون، جگە لە ماوەیەکی کورت نەبێت لەسەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( ٩٩-١٠١ك، ٧٢٢-٧٢٣ز)٤٢، لەو کاتەدا زوحاکی کوڕی قەیسی خارجی بەڵێنیدا بە عەبدوللای

عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، کە ئاشتی بەرپابکەن، دیارە ئەو سەردەمە پاڵنەری هۆزایەتیو دەمارگیریی لەفەلسەفەی حوکمی ئومەویدا بەرەو کاڵبوونەوە دەچوو، بۆیە خەواریجەکانیش ڕازی بوون بەئاشتی، ئیدی بەدرێژایی حوکمی ئومەویو عەباسیی لەتەواوی ئەدەبیاتی خەواریجدا بەئاشکرا ململانێی هۆزایەتی تێبینی دەکرێت دژی قورەیشو هەیمەنەی ناڕەوای ئەو چینە ئۆتۆکراتو سەردەستە٤٢، چونکە ئەوان لەژێر سێبەری ئیسلامدا حوکمێکی ئامورالیان جێبەجێدەکردو بەردەوام پاساویان بۆکارە نائەخلاقیو مۆراڵیەکانیان بە پشگیری تەزویری دەقەکانی ئیسلام دەهێنایەوە، ئەمەش هەمووی ئەوە دەسەلمێنێ سەرهەڵدانی خەواریج ڕوویەکی هۆزگەراییو دواتریش ئیتنیو نەتەوایەتی بوو لەناو موسڵمانان‌دا ٤٤.

## سێ یەم: سەبەئیەکانو زەمینەی دەرکەوتنی بزووتنەوەی خەواریج.

ئایینی جولەکە وەك ئاینێکی ئاسمانیی لە پێش ئیسلامەوە لە ناو نیمچە دوورگەی عەرەبیدا بوونی هەبوو، ئەوان لەسەردەمی ئیسلامدا هاوشان لەگەڵ عیساییو ئاگرپەرستەکان پاشماوەکانیان دەستیان کردەوە بەپلانگێڕان بۆ زیندووکردنەوەی بوونی ڕابردوویان، لەم ڕێگایەشیاندا کەوتنە پلانگێڕانو دروست کردنی پڕووپاگەندە دژ بە خەلیفەو والییەکان٤٥. لە ڕاستیدا دیارترینی پاشماوەکانی ئەم ئایینانە کە لۆژیکیانەو بە بەرنامە کاریان لەسەر لەقکردنی پایەکانی خەلافەت دەکرد، بریتی بوون لە جولەکەکان، ئەوان لەو سەردەمەدا بەنهێنیو بەڕێکخراوەیی خۆیان لە مەتەریزی هەر بۆنەو ئاژاوەو بۆشاییەکی سیاسەتی ئیسلامیدا حەشار دابوو، ئەوان لەهەرێمە دوورە دەستەکانی خەلافەتەوە کاتی ئەوەیان بۆخەملی کە ئیتر ڕووبەڕووی قیەمو

سیاسەتی خەلافەت ببنەوە، هەربۆیە لە نێو سەبەئیەکانەوە دەسپێکی بەر هەڵستکاریان دەستپێکرد. سەبەئیەکان پۆخڵەواتو گەندەڵیەکانی دامەزراوەکانی خەلافەت هۆکاری زیاتر جۆشانی هەستی ئاینیی و قین لە دەسەلآتداری والییەکانیان بوو، ئیتر ئەم ڕەگەزانە وەك هێزێکی بەرهەڵستکاری خەلافەت خۆیان لەرێکخراوێکی نهێنیدا بینیەوە، ئەم ڕێکخراوە لە تەواوی شارە گەورەکاندا ڕێکخراو و شوێنبکەوتوانیان وەك تۆڕێکی پەیوەندیو بەشێوەیەکی نهێنی لە ناو خۆیاندا پێکهێنا.

لقەکانی ئەم ڕێکخراوە لە هەریەك لە ویلایەتەکانی کوفەو بەصرەو میسردا هەبوون، هەندێ ڕەگەزیشیان لەشامو مەدینەدا هەبوو، هاوکات سەرکردەی ئەم ڕێکخراوە جولەکەیەك بوو لە جوولەکەکانی یەمەن، ئەم سەردارە بانگەشەی موسڵمان بوونی خۆی لە سەردەمی خەلافەتی عوسمانی کوڕی عەفاندا ڕاگەیاند بوو ٤٦، بۆ خۆیشی ڕەچەڵەکی خانەوادەکەی دەگەڕاوە بۆ هۆزی ئەزدو ناسراو بوو بە عەبدوڵڵای کوڕی وەهبی ڕاسبیی.

هەندێ دەڵێن عەبدوڵلا جولەکەیەکی خەڵکی سەنعا بوو، کە دایکی ژنێکی ڕەشپێست بوو، ئەم پیاوە لەسەردەمی خەلیفە عوسماندا، دوای ئەوەی بەرواڵەت موسڵمان بوو، ئیتر بە مەبەستی بانگەوازکردن بۆ نەیاری دەوڵەت کەوتە گەڕان بە ناوچە ئیسلامیەکاندا٤٧، ئەم هەوڵەشی بۆ چێکردنی ڕێکخستنێکی نهێنی بوو، لە ئاکامدا ئەم ڕێکخستنەوەو بانگەوازە هزریو مەکراویەکانی بەجۆرێك فراوان بوو کە بەسرەو کوفەو میسری گرتەوەو دواجار گەیشتە ئەوەی مەدینەی پایتەخت داگیربکەنو خەلیفە عوسمان لەچوارچێوەی پلانێکی داڕێژراودا بکوژن٤٨*.

دواتریش ئاژاوە گێڕان پاش هەوڵە سەرکەوتووەکەیانو بۆ نەورۆژاندنی رایگشتی لە دژیان، بەڵێنیاندا بە عەلی کوڕی ئەبوو تالیبو لە ڕیزەکانی سوپای ئەو خەلیفەیەدا بەشێوەیەکی کاتی خۆیان حەشاردا.

دیارە مەبەستی سەرەکیشیان لەو کارەدا داوا نەکردنی خوێنی عوسمان بوو لێیان٤٩، ئیتر سەرەتای ناکۆکییەکان بەتەوژمێکی نوێ دەردەکەوتن،

بەجۆرێ گرفتی سەرەکی خەلافەت لەو کاتە ناسکەدا بوو بە گرفتی دلزینەرەی بکوژانی عوسمان‌و شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵیان، کە بەئاشکرا لەنێو سوپای خەلیفەدا هەبوون‌و خۆیان رێکخراوانە مەلاس دابوو.
ئەمەش ئاماژەیەکی ترسناکی لە لێکترازانی ریزەکانی خەلافەتدا لەگەڵ خۆی هێنا، چونکە بۆچوونی جیاواز لەنێوان موعاویەی کوڕی سوفیان کە والی بوو لەشام، هەروەها لەگەڵ تەڵحەی کوڕی عوبەیدوللاو زوبەیری کوڕی عەووامدا لە هاوەڵە پێشین‌و بەراییەکانی ئیسلام دروستببوو دژی خەلیفە عەلی، ئەمەش بەبۆنەی ئامادەیی بکوژەکانی عوسمان لەریزەکانی سوپاکەیدا.
بەمجۆرە لە دەرهاویشتەی پلانی سەبەئیەکاندا بۆچوونە جیاوازەکان هەردوو جەنگی جەمەل‌و سەفینیان لێکەوتەوە، سەرئەنجام دوای هەردوو جەنگی خوێناوی جەمەل‌و سەفین خۆیان وەك رەوتێکی ئاشکرای سیاسی راگەیاند٥٠.
لەبەرئەوە دەتوانین بڵێین میکانیزمی کاری سەبەئیەکان خۆی لەخۆیدا ئەوەمان پێ دەڵێت کەهێزێکی سیاسی بوون‌و ئامانجی تایبەتیان هەبووە، پێکهاتەی ئەم هێزە سیاسییەش بریتی بووە لەسەبەئیەکان، چونکە هیچ جیاوازیەك لەنێوان سەبەئیەکان‌و خەواریجەکان نەکراوە٥١، تەنانەت حەرقوسی کوڕی زوهەیری سەعدی دامەزرێنەری بیری خەواریج لەگەڵ سەبەئیەکان لە کوشتنی خەلیفە عوسماندا بەشداربوو٥٢. ئەمانە هەموو بەڵگەی بوونی سیاسەتی سەبەئیەکان بوو لە بەگشتی کردنی بیروڕاکانیان وەك هێزێکی دەرچوو لەناو بازنەی خەلافەت، دووا جاریش بەشێوەیەکی ئاشکرا سەبەئیەکان‌و هاوبیرانیان بەڵێن دەدەن بە عەبدوللای کوڕی وەهب کە سەرکردەکەیان بوو٥٣، بۆ ئەوەی سەر لەخەڵکی بشێوێنن‌و نەیاری دەوڵەتی مەدینە بن. ئیتر عەبدوللا بانگەوازەکەی سەرەتا لە حیجازەوە دەستی پێ کردوو دوواتر بەسرەو کوفەیشی گرتەوەو لەمیسردا نیشتەجێ بوو.
دیارە لەسەرەتادا ویستیان بانگەوازەکە لە شامەوە بێت، بەلام دەریانکردن‌و قاویاندان، چونکە شامیەکان لەتەك سیاسەت‌و مەودای کاری خەلیفە عوسمان‌و موعاویەی خزمیدا یەکیاندەگرتەوە، هەر بۆیە بانگەوازەکەی

عەبدوللآیان لەوێ بەبلآووکردنەوەی بێ باوەڕیەو لادان لێکدەدایەوە٥٤.
هبۆنمونە ئەو لەوێدا ڕایگەیاند بوو سەرم سوڕدەمێنێت لەوەی کە دەوترێت عیسا لە ئاخر زەماندا دەگەڕێتەوە، بەلآم موحەمەد لە ئاخیر زەماندا نا گەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەخودای گەورە فەرموویەتی"( ان الذی فرض علیك القران لرد اك الی معاد)"٥٥.
هۆکارێکی تری ئەوەی کەنەیانتوانی لە شامدا دەستپێبکەن، ئەوە بوو کە دەڤەرەکانی شام زیاتر هەواداری موعاویە بوون، ئەوانیش بە سەختی داکۆکیان لە زوو سەندنی خوێنی عوسمان دەکردوو دژی خەلافەت بوون، کە ئەمەش لە بەرژەوەندی هێزی مەلآسدراوی سەبەئیەکان نەبوو لەریزەکانی خەلیفەدا، بەمجۆرە سەبەئیەکان بنکەی سەرەکی خۆیان لە میسردا جێگیر کردوو کردیانە پێتەختی خۆیانو عەبدوللآ خۆی سەرپەرشتی دەکردن.
رێکخستنی سەبەئیەکان لە کوفەش یەزیدی کوڕی قەیسو ئەشتەری نەخەعی لێپرسراویان بوو، ئەوان تۆڕەکەیان دەبرد بەرێوەو کاروباری بەسرەش لەدەستی حەکیمی کوڕی جەبلە بوو٥٦. ئیتر عەبدوللآ لە دەسپێکی کارەکانیاندا وەسیەتی دەکرد بۆ لایەنگرانی، کە یەکەمجار بەتانەو تەشەردان لە والیو ئەمیرەکان دەست پێبکەنو بەناوی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەوە کاربکەن، بۆنمونە ئەو لەسەرەتادا دەیووت عوسمان بەناڕەوا بووە بەخەلیفەو دەبێت پلەو پۆست جێی بهێلێت بۆ عەلی*.
بەم جۆرە شوێنکەوتوانی عەبدوللآ دەستیان کرد بە بلآوکردنەوەی درۆو پڕو پاگەندە دژ بەئەمیرو والییەکانو درۆکانیان لەنامەدا لەم شار بۆ ئەو شار دەناردوو بەسەر خەڵکی عەوامدا وەشانیاندەکرد ٥٧.
تا وایلێهات ژمارەی شوێنکەوتوانیان هێندە زۆر بوو کە ئەو ڕۆژەی هاتن بۆ کوشتنی عوسمان ژمارەیان لە(٣٠٠٠) جەنگاوەر زیاتر دەبوو.
هەروەها گرنگترین شێوازێك کە سەبەئیەکان بۆ چەواشەکردنی خەڵك گرتیانەبەر تەزویرکردنی نامەو نوسراو بوو بەدەم هاوەڵانی پێغەمبەرەوە٥٨، گرنگترین ئەو نامانەش نامەیەك بوو بەناوی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (د.خ)

هەڵیان بەست، کە تێیدا عوسمان تاوانبار دەکاتو ڕێگە دەدا بەخەڵك شۆڕش لە دژی بەرپابکەن. بۆ ئەم مەبەستە کاتێك خەڵك لە عائیشەیان پرسی کە ئەوە ڕای ئەوە یان نا ؟ فەرمووی :"سوێند بەو خوایەی کە ئیمانداران باوەڕیان پێ هێناوە تاوەکو ئێستا لەو بارەیەوە مەرەکەبم لەسەر کاغەز دانەناوە "٥٩.

هەروەها کۆمەڵێك خەڵکیش هاتنە لای عەلیو ووتیان لەگەڵمان بە عوسمان لەخەلافەت دەردەکەینو خوێنی حەلاڵ بووە، ئەویش فەرمووی: " والله ما کتبت الیکم کتابا فقط)· ٦٠. لەهەموو ئەمانەش گەورەتر ئەو نامەیە بوو کە بەدەم خەلیفە عوسمان خۆیەوە هەڵیان بەستو نوسییان گوایە خەلیفە فەرمان دەکات بە کوشتنی موحەمەدی کوڕی ئەبوبەکرو چەند کەسێکی تر، ئەوەبوو دوواتر عەلیو موحەمەدی کوڕی مەسلەمە درۆکەیان بۆ دەرکەوتوو توانییان سەرچاوەی تەزویرەکە بدۆزنەوە کە سەبەئیەکان بوون ٦١.

دیارە ئەم هەموو بوهتانەی سەبەئیەکان لەمێژووداو لە زۆرێك لە سەرچاوەکان وەك ڕاستی تەعبیریان لێ کراوەو بوون بە بەشێك لە مێژووی ئیسلامیی. بەمجۆرە دەتوانین سەبەئیەکان وەك فاکتەرێکی بەهێزی دروستبوونو گەشەکردنی خەواریجەکانو لادان لە هەیمەنەو حوکمی خەلافەت دەستنیشان بکەین.

## چوارەم : جەنگی سەفینو مەسەلەی تەحکیم .

جیاوازی بیروڕای خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیب لەگەڵ والی شام موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان گەیشتە ڕادەیەك تەنها لە ناکۆکی لەسەر سەندنەوەی خوێنی عوسماندا نەوەستا، بەڵکو سەرەڕای ئەوەی کە موعاویە ڕەخنەی لە پەلەکردنی عەلی گرتبوو بۆ وەرگرتنی پۆستی خەلافەت، ڕەخنەیشی لەوە هەبوو کە سەرجەم مووسڵمانان بەیعەتیان پێ نەداوە، لە هەمووی گرنگتر

بەلای موعاویەوە نەرمی نواندنی خەلیفە بوو لە لێپێچینەوە لە بکوژانی خەلیفە عوسمان، کە ئەم نەرمی نواندنە لە ڕوانینی موعاویەدا خاڵی گەرمی ناکۆکیەکان بوو تا پاساوی هەبێت لەژێر سایەو ساباتی دەوڵەتی مەدینەو خەلیفایەتی عەلی دەربازبێت.

موعاویە لای وابوو بوونی بکوژانی عوسمان لەناو سوپای عەلیدا ناڕەوایەو مایەی نیگەرانی بنەماڵەی ئومەویەکانە، هەر لەم سۆنگەیەوە بەیعەتیان بەعەلی نەدا٦٢. ئیتر والی شامو ویلایەتەکەی سەربەخۆ لە دەرەوەی بازنەی خەلافەت کاری دەکرد.

بۆ نمونە کاتێك مالیکی کوڕی حارس لەلایەن عەلییەوە کرا بە والی نەسیبین*، لەبەرامبەردا لەلایەن موعاویەوە کوڕی قەیسی فەهری نێردرا بۆ ئەو هەرێمەو نوێنەرەکەی عەلی کە مالیك بوو دەرکرا٦٣. لەراستیدا پاساوی موعاویە بۆ دەرچوون لە فەرمانی عەلی تەنها سەندنی خوێنی عوسمان بوو بەشێوەیەکی ئاشکرا، بەلأم لەپشت ئەم پاساوەوە چەندین فاکتەری سیاسیو ململانێی هۆزایەتیو دنەدانی خەواریجو ڕێکخستنەکانیان ئامادەیی هەبوو، هەربۆیە لەبەرامبەریشدا عەلی ئەم ڕەفتارەی موعاویەی بە نا دروستو خودی والیشی بەلادەروو یاخی لە قەڵەمدا٦٤، بۆ ئەم مەبەستەش بەئەرکی خۆی دەزانی بیانهێنێتەوە ڕیزەکانی خەلافەت٦٥. دوواجار سوپای خەلیفە بە فەرماندەیی خودی خۆی لە کوفەوە ڕووی کردە شام بۆ ملکەچ پێکردنی موعاویەو ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، لەبەرامبەریشدا موعاویەو ئەوانەی لەگەڵی بوون خۆیان ئامادە دەکرد بۆ هەر ڕووبەڕوو بونەوەیەك لەگەڵ لەشکری خەلیفەدا، ئەوەبوو لەمانگی زیلحەججەی ساڵی (٣٨ك-٦٦٠ز) دا جەنگ لە شوێنێك بەنێوی سەفین ڕوویدا٦٦، ئەم جەنگە چەند هەفتەیەکی خایاندوو لە دەرهاویشتەکانیدا دەیەها هەزار لەڕیزەکانی هەردوولا کوژران، تا لەکۆتایی جەنگەکەدا لەشکری عەلی بەتەواوی لە سەرکەوتن نزیك بوونەوە، بەلأم موعاویە داوای لەعەمری کوڕی عاس* کرد لەم تەنگە تاوییە ڕزگاری بکات، چونکە عەمر سیاسەتمەدارێکی کاراو لێزان بوو، بۆچوونەکانیشی دژی خەلیفەو

لەتەك موعاویەدا بوون، ئیتر ئەوەبوو زۆر فریودەرانەو مەكراوی قورئانی بەكار هێنا بۆ مەبەستە سیاسیەكانی‌و توانی فریای شامیەكان بكەوێت‌و لە نەخشەیەكی دارێژراودا داوای لەجەنگاوەرانی موعاویە كرد كە قورئان بەرز بكەنەوە بەسەرنووكی ڕمەكانیانەوە، ئەم سیاسەتەی عەمر دەسپێكی ئەو هەنگاوانە بوو لە مێژووی ئیسلامدا، كەبەردەوام ئاینیان بۆ لە خشتە بردن‌و قۆستنەوەی بیری سیاسی‌و بەرژەوەندی خۆیان بەكارهێناوە، دیارە ئەم هەوڵەی عەمر لە لای سوپاكەی خەلیفەدا واتای وەستانی جەنگی دەگەیاند، بۆ ئەوەی قورئان حوكمی هەردوولایان بكات٦٧. وەلێ جەنگ وەستان لەناو سوپای عەلییدا بوو بەهۆی ناكۆكی‌و بەشێكیان هەر زوو لە مەبەستی عەمر تێگەیشتن‌و بەگومانەوە سەیریان لە ئاگربەستی بەرەی دۆڕاو دەكرد٦٨، دیارە عەلیش لەسەرەتاوە بە ناوبژێكردنەكە قایل نەبوو، تەنانەت لەدوواییشدا بەناچاری ڕێككەوت٦٩. هەرچۆنێك بێت لەلایەن هەردوولاوە ڕێوشوێنی دانوستان گیرایە بەر. لەلایەن بەرەی خەلیفەوە پاش ململانێیەكی ناوخۆیی ئەبوموسای ئەشعەری دانرا بە نوێنەرو عەبدوللای كوڕی عەباس كە لەسەرەتاوە خەلیفە وەك نوێنەر پێشنیاری كردبوو هەر لەلایەن بەرەی خەلیفەوە كە زۆربەیان عەرەبە دەشتەكیەكان بوون‌و قورەیشی نەبوون درایە دواوە، لەكاتێكدا عەبدوللا زاناو لێهاتووتر بوو، دیارە ئەمەش بەشێك بوو لە سیاسەتی خەواریجەكانی ناو سوپای عەلی بۆ درووستكردنی ئاژاوەو پاساوی لەرێدەرچوون گرتیانە بەر.٧٠ لایەنی موعاویەش نوێنەرەكەیان بریتی بوو لە عەمری كوڕی عاس كە بە كەسێكی زاناو سیاسیی ناسراو بوو، ئیتر ئەوەبوو رێك كەوتن لەسەر دانیشتن لە شوێنێك بەناوی ئەرزح٧١. ئاكامی دانیشتنەكە بریتی بوو لە نوسراوی (التحكیم) لە نێوان هەردوولا دا، لەم نوسراوەدا هاتبوو : "ئەمە ئەوەیە كە عەلی كوڕی ئەبو تالیب‌و موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان لەسەری پێكهاتوون، عەلی لەجیاتی خەڵكی ئێراق‌و موعاویەش لەجیاتی خەڵكی شام پابەندی خۆیان دووپاتدەكەنەوە بۆ هەر بڕیارێك كە نوێنەرەكانیان دەیدەن". لێرەوە ئەم نوسراوە سەرەتای ئاشكرا بوونی

خەواریجی ڕاگەیاند، چونکە لەناو سوپای عەلییدا ئەشعەسی کوڕی* تەمیمی کیندی چوو بۆ لای هۆزی تەمیمو بەفیتی ئەو دروشمێکیان بەرزکردەوەو وتیان حوکم تەنها بۆ خودایەو لەدینی خودا دا مرۆڤ ناکرێتە ناوبژیکار٧٣، خەلیفەش لە بەرامبەر ئەو دروشمەدا تەنها ئەوەندەی بۆ کرا وتی :" کلمه حق یراد بها الباطل" ٧٤" ئەو ووتەیەیان ڕەوایە بەڵام مەبەستیان پێی ناڕەواییە. هەربۆیە عەلی بەگەیشتنەوەی بۆ کوفە بڕیاری خۆی دەداتو لەبەرامبەر بڕیارەکەی عەلیشدا دوازدە هەزار(١٢٠٠٠) سەرباز لەڕیزەکانیدا جیادەبنەوەو لە فەرمانی دەردەچن. لێرەوە خاڵی ڕاگەیاندنی هێزێکی سیاسیو ئاشکرا لە کیانی ئیسلامیدا دەست پێدەکات، چونکە ئەوان توانییان وەك خواستێکی سیاسیو ڕووپۆشێکی ئاینی بنەماکانی (تحکیم) ڕەدبکەنەوە٧٥، لەوێشەوە بیرووباوەڕی خۆیان بە دروشمی حوکم تەنها بۆ خوایە دامەزراند.

ئیتر دەرچووانی ئەم ململانێیە ناو دەبران بە خەواریج٧٦. چونکە لە دەرئەنجامی ناوبژیکردنەکە نەخشەی ئاشکرای خەواریج دەرکەوت. دیارە دەبوو هەر لە دانانی ئەبو موسای ئەشعەریەوە ئەو هەستە بزانرایە، چونکە عەمر بەئاشکرا ئەبوموسای فریوداو لە نەخشەیەکدا ڕێك کەوتن لەسەر یەکسان کردنی عەلیو موعاویەو هەردوو ڕازیبوون تا لەسەر خەلافەت لایاندان، دواتر بڕیاریاندا خەلیفەیەکی نوێ هەڵبژێرن٧٧، بەڵام کاتێك ئەبوموسا چوو بۆ سەر میمبەروو عەلی لەسەر کار لابرد، عەمر لەسەرەی خۆیدا پشتگیری لە کارخستنی عەلی کردوو موعاویەی کرد بەخەلیفە، ئەمەش لە ڕووی سیاسیەوە سەرکەوتنێکی گەورەبوو بۆ موعاویە. بەمەش خەواریج داوایان لە عەلی کرد پەشیمان بێتەوە لەو هەڵە سیاسیەی کە کردی، وەلێ عەلی پەشیمان نەبویەوەو پێی وابوو کار لە کار ترازاوە. ئەوانیش بەتێڕوانینی خۆیان کافریان کرد٧٨.

بەم جۆرە (١٢٠٠٠) سەرباز لەبەرەی عەلی جیابوونەوەو ڕویانکردە دێیەك نزیك کوفە بەناوی حەرورا٧٩.

# باسی سێ یەم:

## بیروباوەڕەکانی خەواریج و ڕاڤەی زاراوەکانیان

### یەکەم: خەواریجەکان کێن ؟

هەر لەسەرەتاوە  زۆینەی خەواریجەکان لە ڕووی پێکهاتەی ئێتنیو نەژادیەوە لە عەرەبە کۆچەریو دەوار نشینەکانی دوور لەژیانو هەموو ڕۆحێکی شارستانی بوون. ٨، بەجۆرێك مێژوونوسی گەورەی ئیسلام  تەبەری دەربارەیان دەڵێ : "خەواریجەکان لە ئامێزی هۆزی نەوەی تەمیم  لە دایك بوون"٨١. هەربۆیە لەدەسپێکی دەوڵەتداریی قورەیشیەکانەوە ئەم دەوارنشینو سارا پۆشانە هەستی یاخی بوونیان لە یاساو دەوڵەتداری بلێسەی سەندوو ئارەزووی یاسایەکیان دەکرد لەگەڵ سروشتی کۆچەرایەتیو بەداوەتیاندا بگونجێتو  لەدەرەوەی سروشتی قورەیشدا بێت ٨٢.

هەرچەند زۆرجار ڕۆژهەلاتناسەکان زیادەڕەوییان لەپەسەندی هەموو باوەڕەکانی ئەم ڕەوتە کردووە، وەلێ ناتوانین هەموو باوەڕکانیان ڕاڤەیەکی دیموکراسیانەو یەکسانی خوازانەی ئەمڕۆیان بۆ بکەین، چونکە ئەوان لە زۆرێك لە بیروڕاکانیاندا تایبەتمەندی تەکفیرو توندوتیژیو خوێنڕشتن سیمای سەرەکیان بوو، بەمەش  هەموو خواستە یەکسانیخوازو وەك یەك ژیانیەکانیان خراوەتە ژێر پرسیارەوە، کەچی ڕۆژهەلاتناسەکان هاتوون هەموو باوەڕەکانیان بەدەر لە ڕۆحی دەمارگیریو ڕایەڵە دوا کەوتووە

کۆمەڵایەتیەکەیان پێناسەیان کردوون، تەنانەت بە موسڵمانە دەستورخوازو کۆماریەکان نێویاندەبەن.
سەبارەت بە مەهامو تەمای بزووتنەوەکەشیان دەڵێن: " تەنها بانگەوازێك بوو بۆ گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام "، بەردەوامیش ڕۆڵی تێکۆشانی دەوارنشینەکان لەڕووی دەوڵەتدا بەرچاو دەخەنو زیاد لەپێویست گەورەیان دەکەن٨٣. ئەمەش چونکە خەواریجەکان بە زۆری پێکهاتبوون لە هۆزەکانی تەمیمو ڕەبیعەو سەنیفە، کە بە بۆچوونی ڕۆژهەڵاتناسەکان هەر لەسەردەمی نەزانیدا لە ناو عەرەبەکاندا ئاستیان بەرز بووە، وەڵێ بە هاتنی ئیسلام ئەم ئاستەیان لە دەستداوە، چونکە بۆخۆیان پێیان وابوو فتوحات تووشی بەڵایەکی گەورەی کردوونو بەڵگەشیان لە نێوچاوی ئەرستوکراتیەتی قورەیشدا دەبینیەوە، لە بەرئەوە بزووتنەوە سیاسیەکەیان بە پاڵنەری ئەو تێگەیشتنەی خۆیان دەست پێکرد، بەڵام لە ژێر پەردەیەکی ئاینیدا، ئەم هەڵوێستەشیان بەڕوونی لە کێشەی تەحکیمدا دەرکەوت٨٤.
هەندێ لە مێژوونوسان لایان وایە خەواریج بریتین لە عەرەبی ڕەسەن. بۆ نمونە ( نیکلسۆن) دەڵێ:" خەواریج لە عەرەبە سەرەتاییەکان بوون کە لەبەسرەو کوفەدا جێگیرببوون، ئەوان سروشتێکی سەرەتاییان هەبوو، هەربۆیە بەرگەی شارو سیڤیل ژیانو چوارچێوەی یاسایان نەدەگرت، چونکە کایگەربوون بە ئاکارو سروشتی سەرەتایی خۆیان کە لە باپیرانیانەوە بۆیان مابویەوە٨٥.
هەروەها (خوابەخش) دەڵێ:" خەواریجەکان عەرەبی سەرەتایین، کەسێك لە نێوانیاندا نییە بە قورئان ئاشنابێتو نوێنەری ڕاستەقینەی هۆزە عەرەبەکانن"٨٦. ڕۆژهەڵاتناسانی تر وێك چوونێك لەنێوان ئەوانو جۆن کالڤینیەکانی* سەدەی شازدەهەمی ئەوروپادا دەکەن، ئەوانەی لەچوارچێوەی بزووتنەوەی پرۆتستانەکاندا دژی کلێسای کاتۆلیکی ڕاستبوونەوە، چونکە خەواریجەکانیش وەك گروپێکی ڕیفۆرمیستی پرۆتستانت

دەستیان پێکرد، ئەوانەی بەرگرییان لە مافەڕەواکانی مەسیحیەکان دەکردو لە هەمان کاتیشدا پێچەوانەی فەرمانە ئاسمانیەکان بوون ٨٧.

## دووەم: تایبەتمەندیەکانی خەواریج

خەواریجەکان هەرچەندە بەپێی بەشەکانیان و بەگوێرەی کاتو سەردەم گۆڕان لەسیفەتو بۆچوونیاندا ڕوویداوە، بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین ئەوان کەسانێکی لە ڕادەبەدەر پەرستش کارو نوێژکەر بوون٨٨. لەبواری بەندایەتیشدا توندو تۆڵو زۆردڵسۆز بوون بۆ بیروباوەڕەکەیان. تایبەتمەندیەکی تریان لەوەدا بوو کە قوربانی دەرو ئازابوون٨٩. لەم بارەیەوە (نیکسۆن) دەڵێ :"خەواریجەکان نمونەی دیارن لە قوربانیدان لە ڕێگەی باوەڕو خۆ بەکوشتدان بۆ ئامانجەکانیان.٩٠. چونکە ئەوان بەردەوام داکۆکیان لە جیهاد دەکرد، جیهادیان بە هۆکارێك دادەنا بۆ دروستبوونی شکۆمەندیان لەبەرامبەر دوژمنانیان. لەم بارەیەوە شەهرستانی لە باسی زۆری‌و توندیی لەبەندایەتییاندا دەڵێ: " ئەهلی نوێژوو ڕۆژوون، دوورن لەدرۆکردن"٩١. بۆ نمونە کاتێك خەلیفە عەلی بۆ مەبەستی هێنانەوەیان عەبدوللاّی کوڕی عەبباس دەنێرێت بۆ ناویان تا بۆیان ڕوونبکاتەوە لەهەڵەیەکی گەورەدان، دەبینێت هەموویان لە ناوچەی نەهرەوان کۆبوونەتەوە، گەنجەکانیان لەبەرەکانی جەنگدا لەنوێژدانو سوجدەکانیان زۆر درێژ دەکەنەوە، شەوان شەو نوێژ دەکەنو قورئان دەخوێنن. هەروەها بۆچوونەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە دەمارگیری لە مامەڵەیاندا هەیەو زانیاریان لەشەریعەتی ئیسلامیدا نیە، واتە لە ئاینداریدا خاوەنی بیرو لۆژیکێکی واقیعی نینو شوێن ئارەزوو سۆز کەوتون، یاخۆ خاوەنی قوتابخانەیەکی عەقلاّنی نەبوون، هەروەك چۆن موعتەزیلە *، خاوەنی ئەو قوتابخانەیەنو لە ئاکارو بڕوایاندا ڕەنگی دابوویەوە٩٢. سیفەتێکی تریان بێ باکییانە لە کاتی ڕووبەڕووبونەوە لەتەك

دوژمنیاندا٩٣، ئەم بیّ باکیەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە سروشتی جوگرافیو ژینگەی کۆمەلاّیەتیان لە سەحرادا لەسەری ڕایهێنابوون، لەلایەکی ترەوە نیشتەجیّ بونیان لە بیابانو سەرەتایی بونیان وەك بەهرەی هۆزگەرایو دەمارگیری تێیدا چاندبوون٩٤ .

## سیّ هەم: ڕاڤەی زاراوەی خەواریج و ناوەکانیان.

خەوارج ناوی پارتێکی سیاسییەو ڕووپۆشێکی ئاینی داوە بە سەر بزووتنەوەکەیدا. لە سەرچاوە مێژووییەکاندا چەندین ناوی جیاجیا بۆ ئەم جوولاّنەوە بەکار دێنن، هەریەك لەم ناوانەش ئاماژەیە بەسەردەمو ڕووداوێكو خواستێکی تایبەت کە پێی ناسراون، بەم جۆرە:-

١. خەواریج :

هەندێك پێیان وایە خەواریج نازناوێکی سیاسیە هەروەك چۆن ڕەوافیزەکان ناوێکی تایبەتیان هەبوو، لەم بارەیەوە شەهرستانی دەڵێت : " لەسەرەتادا مەبەست لەخەواریج دەرچوونی هەموو ئەوانەبوو کە لە ڕیزەکانی سوپای عەلی دەرچوونو بە مەسەلەی تەحکیمو چارەسەرکردنی جەنگی سەفین ڕازی نەبوون"، لەشوێنێکی تردا دەڵیّ : "خەواریج هەموو دەرچوونێك دەگرێتەوە ئیتر لە ڕۆژانی سەردەمی هاوەلاّن بێت یاخود هەر سەردەمێکی تر "٩٥. هەندێکی تر پێیان وایە ناوەکەیان خۆیان هەڵیانبژاردووە و مەبەستیان لێی ئەوەیە کە لە پێناو خوادا لە ڕیزەکانی عەلی دەرچوون٩٦. بەڵگەشیان ئەم ئایەتی قورئانی پیرۆزە کەدەفەرمێت : "ومن یجاهد فی سبیل اللة یجد فی الارض مراغما کثیرا وسعه، ومن یخرج من بیته مهاجرا الی الله ورسوله ثم یدرکه الموت فقد وقع اجره علی الله "٩٧.

٢. حەرەورا :-

ئەم ناوەی خەواریجەکان کاتێك دروستبوو کە بۆیەکەم جار دەرچوونو چوونە شوێنێکی نزیك کوفە بە نێوی حەرورا، ئیتر هەر بەو ناوەوە نێو دەبرانو پێیان دەوتن حەروریەکان٩٨.

٣. شورات:

مەبەستیان لەم سیفەتە ئەوەبوو، ئەوان کۆمەڵێکن خۆیان فرۆشتووە بەخودا٩٩، ئەم ناوەشیان لەم ئایەتەی قورئانەوە وەرگرتبوو کە دەفەرموێت : " ان الله اشترى من المومنين انفسهم واموالهم بان لهم الجنه "١.

٤. موحەکەمە :

ئەم ناوەیان لە دروشمەکەیانەوە بەسەریاندا سەپاو بوو، ئەو دروشمەی کە بەرزیان کردبویەوە لە دوای ڕازینەبوونیان بە مەسەلەی تەحکیم. ئەوەی کە دەیانووت حوکم تەنها بۆ خوایە ١,١، مەبەستیان لەم دروشمە ڕاکێشانی پەنجەی کوفر بوو بۆ هەموو ئەوانەی ڕازیبوون بە حوکمی نوێنەرەکانی عەلیو موعاویە، چونکە ئەوان پێیان وابوو دەبوو حوکم بە قورئان بکرایە.

٥. ئەلماریقە :

ئەم ناوەش بەئامازە بەفەرموودەیەکی پێغەمبەر (د.خ) بۆیان داتاشراوە کە دەفەرمێت :سيخرج قوم من امتى فى اخر زمان، احداث الاسنان، سفه الاحلام، يقولون من قول خير البرية، يقراون القران لايجاوز حناجرهم يمرقون من الدين كما يمرق من الرمية فاذا لقيتموهم فاقتلوهم فان فى قتلهم اجرا لمن قاتلهم عند اللة يوم القيامة :١,٢* .

٦. بوغات:

ئەم ناوە بە ئاماژە بەئایەتێکی قورئانی پیرۆز لێیان نراوە کەدەفەرمێت :" وان طائفتان من المومنين اقتتلوا فاصلحوا بينهما فان بغت احداهما على الاخرى فقاتلو التى تبغى حتى تفىء الى امر الله "١,٣*.

٧. نەواسیب:

ئەم ناوە لە تایبەتمەندی ئەو خەواریجانەدا زۆر باو بووە، کە زۆر سەخت خەلیفایەتی عەلییان دەدایە دواوەو دوژمنکاریان دەکرد١,٤، بەتایبەتی لە دوای مەسەلەی تەحکیم . بەم جۆرە هەندێك لە ناوەکان خۆیان وەك شانازی بەکاریان هێناوە، یاخۆ هەندێکیشیان نەیارانیان بۆیان داتاشیون‌و پێیانەوە دەناسرانەوە.

## چوارەم : لە گرنگترین گروپەکانی خەواریج و بیرو بۆچوونەکانیان.

خەواریج وەك دەرهاویشتەی کێشەکانی پەیوەست بە ژیانی خەلافەت کۆمەڵگایان بەرەو رەوتێکی جیاواز لە مەبەست‌و خواستی دەسەڵاتی خەلافەت تێگەیاند١,٥، هەربۆیە لە سەرەتاوە تێڕوانینیان کورتکرابوویەوە لە بیرێکی سیاسییانەی رووت، کە ئەویش مەسەلەی تەحکیم بوو لە شوێنگیربونی خەلیفەیەك لە خەلافەتدا. وەلێ هەر زوو ئەو زانیاریە سیاسیانەیان تێکەڵ بە لێکۆڵینەوە لاهوتیەکان کرد١,٦، چونکە ئەوان وەك ئۆپۆزسیۆنێك بە حوکمی هەلومەرجی هۆشیاری‌و بوونی کۆمەڵایەتییان ناچار بوون، هەمان پەردە پۆشی ئایینی بۆ پاساوی ململانێکانیان لەتەك حوکمی ئایینی‌و سەنتەردا بەکار بهێنن تا لە سایەی مەزهەبێکی داتاشراو بەخۆیان بەرژەوەندیی نەتەوەیی‌و سیاسیی‌و ئابوریيان ڕاگرن١,٧، ئیتر ئەوە بوو لە میانی بەرژەوەندیەکانیاندا دەبوو بانگەشەکردن بۆ دادو یەکسانی لەپێشچاوبگرن، تا نەتەوە گەلێکیش کە بەرژەوەندییان لەتەك ئەو

خواستانەدایەو نەیاری خەلافەتن لەدەوری خۆیان کۆبکەنەوەو هەڵیانسوڕێنن. لێرەشدا جەنگە سیاسیە خوێناویەکەیان کردەوە جەنگێکی کۆمەڵایەتی ١٠٨، لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازی سیاسیو کەلتووری ڕۆڵی بەرچاوی دەبینی لە دروست بوونی بۆچوونی نوێ لە ناو خەواریجدا١٠٩. لەم بارەیەوە لوئەی صافی لە کتێبی ( العقیدە الاسلامیە) دا هێناویەتیو دەڵێت : "لە پشت هەموو جیاوازییەکی سیاسیەوە جیاوازییەکی عەقیدەییش داتاشراوە"، هەربۆیە کاتێك هێزێکی وەك خەواریج بە هۆی جیاوازی سیاسی (تحکیم)ەوە دروست دەبێت دواتریش حەوجێ بە عەقیدەیەکی ئاینی تایبەت بەخۆیان دەبن١١٠ . ئاشکرایە خەواریجەکانیش لەو کاتەوە کە ڕیزەکانی عەلییان بەجێ هێشت کۆمەڵێکی پابەندو لەسەر یەك ڕێباز بوون، ڕێگاکەشیان جەنگان بوو دژی خەلیفەی موسڵمانان، بەلأم کاتێك عەبدوللأی کوڕی عەباس بە فەرمانی عەلی بەشێکیانی بە بەلگەکانی گەڕاندەوە بۆ سایەی خەلافەت، ئەوکات جیاوازی بۆچوون لە ناو ئەوانیشدا دروست بوو، کە ئەمەش دەتوانین بە دەسپێکی پەرتبوونی ڕیزەکانیانو دروستبوونی گروپەکانیان بژمێرین١١١. هەر لێرەوە تێدەگەین کەخەواریج دەبوو لەگەڵ سەردەمو لەگەڵ نەتەوە جیاوازەکاندا تایبەتمەندی جیاوازو جۆراو جۆریان هەبێت، هەربۆیە پاش بلأو بونەوەیان لە ناوچەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا دابەشبوون بەسەر چەندین ڕەوتی جیاجیادا ١١٢. بەشێوەیەك مێژوو نووس بەغدادی ژمارەیان دادەنێت بە بیست ڕەوتی جیاواز، کە بەپێی بەغدادی گرنگترینیان بەمجۆرە دیاری کراوە " المحکمة، الازارقة، النجدان، البیهیة، العجادرة، الثعالبة، الاباضیة، الصفریة "١١٣.

## گرنگ ترین گروپەکانی خەواریج .

یەکەم : المحکمە الاولی: -

ئەم ڕەوتە لە سەرەتا ترینیانن، هەموو ئەوانە دەگرنەوە کە لە سوپای عەلی جیا بوونەوەو چوون بۆ حەرورا، سەرکردەکەشیان بریتی بوو لە عەبدوللای کوڕی وەهبی ڕاسبی، هەروەها عەبدوللای کوڕی کەوای‌و عیتابیش لە گەورە سەردارانی ئەم ڕەوتە پێشەنگەی خەواریج بوون١١٤. ئەوەی لەسەر ئەم گروپە دەوترێت ئەوەیە کە کەسێکیان بەناوی کوڕی یەشکری لە کاتی ناوبژیکردنەکەدا لە هەریەك لە سوپای عەلی‌و موعاویە کەسێك دەکوژرێت‌و پاشان هاوار دەکات لە هیچ کام لەو سوپایە نییەو بەریە لێیان، ئیدی بە دوازدە هەزار سەربازی جەنگاوەرەوە دەردەچن بۆ حەروراو ئۆردووی جەنگو مەشق بۆ ڕووبەڕووبوونەوە ساز دەکەن١١٥. دواتریش هەر بەو ناوەوە دەناسرێن. سەبارەت بەبیرکردنەوەشیان ئەمانە پێیان وابوو هەریەك لە عەلی‌و عوسمان کافرن‌و لە ڕاستە شەقامی دین لایان داوە، هەربۆیە نەخشەی خەلافەت بۆ ئەوان ڕوو بەڕوو بوونەوەیان بوو، ئەوەبوو سەرئەنجام لە جەنگی نەهرەواندا سالی (٣٨ك – ٦٥٨ز) زۆربەیان لەنێوچوون‌و ئەوانەیشی کەمانەوە تەفرو تونا کران. سەرچاوەکان دەڵێن ئەوانەی ڕزگاریان بوو بەمجۆرە هەڵهاتن، کە دووانیان بۆ عوممان‌و دووانی تریان بۆ هەرێمی جەزیرەو دوانیشان بۆ سەجستان‌و یەکێکی تریان بەرەو یەمەن دوورکەوتنە کە دواتر باس لەهەریەکەیان دەکەین116.

دووەم : ئەزاریقە ( الازارقە ) : -

ئەم ڕەوتە بریتی بوون لە شوێنکەوتوانی ئەبو ڕاشدو نافعی کوڕی ئەزرەق١١٧. سەرەتای دەرچوونیان لە ناوچەی بەسرەوە بوو، لەوێشەوە

بەرەو ئەهواز کشان، ئەمانە مانەوە تا لەسەردەمی عەبدوللآی کوڕی زوبێر دا بوون بە زۆرترین ئەندامانی بزووتنەوەی خەواریج.
لە گرنگترین تایبەتمەندی ئەوان ئاماژە بەوە دەکرێت، کە بە توندڕەوییان جیادەکرانەوە، چونکە ئەوان پێیان وابوو هەموو سەرپێچیەك هاوەڵدانانە بۆ خودا، هاوکات کوشتنی ژنو منالّ لە بیرکردنەوەی ئەواندا ڕێگەی پێدرابوو. گەشەکردنی ئەم گروپە لەوکاتەوە بوو کە نافعی کوڕی ئەزرەقییان کردە ئەمیری خۆیان، ئیتر هەر بەناوی ئەمیرەکەیانەوە بانگدەکرانو تەواوی موسڵمانانی عومماو یەمامە لەدەوریان خڕبوونەوە دژی دەسەڵاتی خەلافەت١١٧.

سێیەم: النجدات: ـ
ئەم ڕەوتەش شوێن کەوتەی نەجدەی کوڕی عامری حەنەفی بوون، ئەمانە لە سەرەتادا بەشێك بوون لە شوێنکەوتوانی نافعی کوڕی ئەزرەق، پاشان جیابوونەوەو وەك ڕەوتێکی سەربەخۆی فیکریو سیاسی وەدیارکەوتن، هۆکاری ئەم پەرتەوازەییەش لەوەدا بوو کە بۆیان ڕوونبوەوە نافع بڕیاری کوشتنی ژنو زارۆگەلی داوە، بۆیە چوون بۆ لای نەجدی کوڕی عامرو بەڵێنیان بەودا کە ئیتر شوێنی بکەون. ئەوەبوو خەواریجەکانی یەمامە هەموویان بوونە لایەنگری ئەم ڕەوتە، وەلیّ دواتر ئەمانیش پەرتەوازە بوونو بوون بە سێ کۆمەڵەوە بەم جۆرە:
١. بەشێکیان لەگەڵ عەتیەی حەنەفی بوون لە سەجستان.
٢. بەشێکیان لەگەڵ ئەبو فدیك بوون .
٣. پاشماوەکانیشیان لەگەڵ نەجدی کوڕی عامر مانەوە١١٨ .
سەبارەت بەبیروبۆچوونەکانی ئەم ڕەوتەش سەرچاوەکان دەڵێن شلڕەو تربوو لەوانیتر، بۆنمونە ئەمان پێیان وابوو زیناکەر بە موسوڵمانی دەمێنێتەوە ئەگەر زینای کرد، بەلآم درۆی بەردەوام لەئاکامدا هاوەڵدانانە بۆخودا،

لەکاتێکدا ئـەم تاوانانـە لەلایـەن گروپـەکانی تـرەوە زۆر بەسـەختی بڕیاریـان لەسەر دەدرا.

چوارەم: صەفارییەکان :ـ
صەفاریەکان لەخەواریجە شوێنکەوتووەکانی زیادی ئەصفەر بوون، ئـەمانیش لە بۆچووندا لە ئەزاریقە دەچوون، بەلاّم ڕێگەیان بەکوشتنی ژن و منداڵ نەدەدا لەکاتی کردنی سەرپێچیدا١١٩.

پێنجەم : عەجاریدە ( العجاردة ) .
شـوێنکەوتوانی عەبدولکـەریمی کـوڕی عـەجرەد بـوون١٢٠، ئـەمانیش لـەناو خۆیاندا بوون بەهەشت بەشەوە لەوانە : الحازمیة، الشعبیة، الاطرافیة، ذکر الخلیفة، المعلومیة، المهجومیة:١٢١.

شەشەم: ئەبازییە ( الاباضیة ) .
سـەرکردەکەیان بریتـی بـوو لـە عەبـدوڵلأی کـوڕی ئەبازیـە، سـەرەتای دەرکەوتنیـشیان دەگەڕایـەوە بـۆ سـەردەمی مـەروانی کـوڕی موحەمـەد، ئەمانیش دواتر بوونـە چـوار بـەش : الحفـصیة، الحارثیـة، الیزدیـة، اصـحاب الطاعة : ١٢٢.

حەوتەم: بەیهەسیەکان .
شوێنکەوتەی بەیهەسی کوڕی هەیسەمی کوڕی جابر بوون، ئەم ڕەوتە پێیـان وابـوو بـاوەڕ زانیارییەکـە لەدڵدایـەو کـردەوەو گوفتـار هـیچ ڕۆڵـی نیـە لـە باوەڕدا١٢٣.

دیـاره هـەموو ئـەم ڕەوتانـەی خـەواریج بـە هـۆی جیـاوازی بۆچـوونی سـەرکردەکانیانەوە بـوون، هەربۆیـە نـاوی هەربەشێکیـشیان بـەناوی سەرکردەکەیانەوە بووە ١٢٤، نەك بـەناوی مەزهەبەکـەیان، لەگـەڵ ئەوەشـدا بەپێی شوێنو کاتو زەمینـەی واقیـع گۆڕانکـاری بەسـەر بۆچـوونو نەخـشەو پلانیاندا هاتووە ١٢٥.

## پێنجەم: لە دیارترین بیروباوەڕەکانی بزووتنەوەی خەواریج:-

هەرچـەندە خەواریجـەکان وەك ڕەوتـە ئیـسلامییەکانی تـر خـاوەنی قوتابخانەیـەکی فیکـریو عـەقلانیی نـەبوون، هـەروەك چـۆن ڕەوتـەکانی وەك موعتەزیلـەو ئەشـاعیرەو شـیعە قوتابخانـەی مـەنتیقیو عـەقڵیی ئاڕاسـتەی دەکـردن، بـەڵام توانیبویـان لـە دەرهاویـشتەی بزووتنەوەکەیانـدا، چـەندین بۆچـوونی خۆیـان لـەڕووی سیاسـییو ئایینیـەوە لـە بیروبـاوەڕی خۆیانـدا بچەسپێنن١٢٦. بەجۆرێك لـە بـیری سیاسییانەوە چـەندین بۆچـوونی ئـایینی بەدی دەکرا، هەرئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە ئەم ئۆپۆزسیۆنە عەرەبییـەی سـەرەتا لـەڕێی پـەنا بردنیـەوە بـۆ ئـاینو شـیکردنەوەی ئـاینیی لـە ڕووی مەزهەبییەوە پرۆسەی گۆڕانکاریی قوڵو گشتگیری خـۆی لـە دەسـت بـداتو ئەو دەوڵەتەش وێران بکات کە دەیەویست ڕزگاری بکـات، بەمـەش وای لێهـات تێکۆشان لەپێناو دادو یەکسانی تێکەڵی ناکۆکی فیقهیو تایەفەگـەرایی بێـتو وەر گەڕێتە سەر تێکۆشانێکی جیاخوازیو ناوچەگەراییو لە ئاکامیـشدا ببێتـە هۆی لە تکردنـی دەوڵـەتی ئیسلامیو تێکشکاندنی بونیـادی ئـابوریو ڕایەڵـە فیکریە ڕاستەقینەکان.

هاوکات لە ئەنجامی ڕۆچوونی خەواریج لە فیقهدا نەك لـە لۆژیـكو عـەقڵ١٢٧، واتە لە ئەسمائو سیفاتدا ڕێگای خۆیان کردەوە. چونکە پێیـان وابـوو تاکـە کۆمـەڵێکن کـە موسـڵمانی سـەر ڕاسـتبنو بەرنامەکەشـیان گەڕانەوەیـە بـۆ ئیـسلامیی سـەرەتاو بانگەشـەی برایـەتیو یەکـسانیش کرۆکـی

باوەڕەکەیانە١٢٨. لەم بارەیەوە (دیمومبین) دەڵێت :" بانگەشەکردنی خەواریج بۆ برایەتیو یەکسانیی کۆمەڵایەتی وادەکات بە موسڵمانە بیوریتانیەکان نێویان بەرین"١٢٩، چونکە خەواریجەکان خۆیان بە نوێنەری دیموکراتییەت دەزانی لە دەسەڵاتدا١٣٠. لە سەر ئەم بنەمایەش بە درێژایی حوکمی ئومەوی شۆڕشیان کرد دژی دیسپۆتیزمو پشتاو پشتی، چونکە ئەوان لەسەر ئەساسیو تۆرەمەی بنەماڵەو دەمارگیری دروستببوون١٣١.
ئەوەی گرنگە لێرەدا کاریگەریەکانی سەر خەملێنو سەرهەڵدانی بیرکردنەوەی خەواریجە، هەربۆیە دەبینرێت بەشێوەیەکی دیار کاریگەریی دەرەوەی نیمچە دورگەی عەرەبی لە بەرنامەیاندا هەبوو، ئەوان بەهۆی کۆچەرییانەوە زۆربەی نەریتەکانیان گواستبوەوە بۆ ناوخۆیان، لەوانە نەریتەکانی یەکسانیو دەمارگیرییو خێڵایەتیو ژیانی کۆمەڵایەتییو پێکەوەژیان، هەموو ئەمانەش فەرهەنگی نەتەوەکانی دەرێی عەرەب بوون، چونکە سروشتی کۆچەریانەی خەواریجو پەلکشانیان بۆ دەورو بەر بەهرەمەندی کردبوون لەو ژیانەی کە بیروباوەڕەکەیانی پێڕەنگرێژکرابوو، هەروەها زۆربەی ئەم خەواریجانە لە عێراقو باکوری ڕۆژهەڵاتی عیراق دەرکەوتن، چونکە زۆرینەی خەڵکی ناموسوڵمان لەوێ بوون، هەربۆیە کاریگەریەکی زۆریشیان لەسەر بیری خەواریج هەبوو، بەتایبەتی کاریگەری ئاینی مەسیحیو زەردەشتیو مەزدەکی کە عەجەمەکان وەك پێکهاتەیەکی ڕۆحی مامەڵەیان لەتەك دەکردن١٣٢.
لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوون هەیە دەڵێت :" بیروباوەڕی خەواریج کاریگەر نەبوو بە فەلسەفەی ئەغریقیو ڕۆشنبیری فارسی، هەروەك چۆن عەرەب کاریگەربوون پێی، چونکە ئەوان پارێزگاربوون لەسەر قییەمی سەرەتایی خۆیانو دەستوری ڕەسەنی ئیسلامیی، ئەو بۆچوونانە تەئکیدیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە خەلیفە مرۆڤێکی ئاساییەو تاوانو هەڵە دەکات، لەم کاتەشدا پێویستە ڕاست بکرێتەوە، ئەگەرنا شمشێر حوکم دەدات١٣٣. بەڵام ئێمە پێمان وایە بۆچوونی یەکەم ڕاسترە، چونکە ڕواڵەتەکانی یەکسانیو بانگەشەکانی خەواریج ڕەنگدانەوەی ڕۆشنبیریو کلتورییو ئاینییان پێوە

دیاره، کە لەفەرمەنگی نەتەوەکانی تردا زیندوو بوون، گرنگترین بۆچوونەکانیشیان بریتی بوو لە ( تێڕوانینیان بۆ خەلافەت)، چونکە بابەتی خەلافەت لە ئیسلامدا لە یەکەمین کێشەکان بوو کە کۆمەڵی موسوڵمانانی لێك ترازان ١٢٤.

لەراستیدا خەلافەت یان (الامامە) لە ئیسلامدا یەك واتا دەگەیەنن، ئەویش بریتییە لە سەرکردەی موسوڵمانان یاخۆ ئەو کەسەی کە فەرمانەکانی موسڵمانان جێبەجێ دەکات١٣٥. ئیمامەت ئەوکات بەپێی تێڕوانینی ئەهلی سوننەتو جەماعەت چەند مەرجێکی هەبوو، لەوانە پێویست بوو دادپەروەر، زانا، رەچەڵەك قورەیشی بێت. شیعەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو، بەلأم دەیان ووت دەبێت لە بنەماڵەی عەلی بێت١٣٦.

هەرچەندە ئەم بۆچوونانە یەك لایی نەکرانەوە، تەنانەت ئیبن خەلدوون پێی وابوو مەرجی قورەیشیی بوون بۆ خەلیفە تەنها دۆخێکی کاتی بووە، بۆ ئەوەی یەکێتی موسوڵمانان بپارێزرێت، ئەگینا پێویست نیە خەلیفە قورەیشی بێتو دەکرێ تەنها موسوڵمان بێت١٣٦. بەلأم تێڕوانینی خەواریج لەسەر ئیمامەت جیاواز بوو، ئەوان پێیان وابوو خەلیفە دەبێت بە هەڵبژاردنێکی ئازاد لەلایەن موسوڵمانانەوە هەڵبژێردرێت، ئیتر هیچ پێویست ناکات، قورەیشی بێت یان بەندەیەکی حەبەشیی جیاوازی نیە، بەلأم تاکە مەرج لە ئیسلامدا بۆ خەلیفە ئەوەسە ملکەچی فەرمانەکانی خودا بێت، ئەگەرنا لادەبرێت١٣٧. دیارە خەواریجەکان لە سەرەتادا ئەم بۆچوونەیان نەبوو، ئەوان تاکە مەرجیان بۆخەلیفایەتی ئەوەبوو کە پێویستە خەلیفە عەرەب بێتو موسڵمان بێت١٣٨، بەلأم کە زانییان مەوالییەکان، یان موسڵمانە نا عەرەبەکان هێدی هێدی دەبنە تەنها مەئوای حەوانەوە و پارێزەرییان بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەی ئومەویەکان، ئیتر وەك هێزێکی مرۆییش بەخێرایی هاتنە ڕیزەکانیانەوە، ئەوکات باوەڕیان گۆڕاو گوتیان خەلیفە تەنها موسوڵمان بێت ئیدی لەهەر ڕەگەزو بنەچەو تۆرەمەو نەتەوەیەك بێت قەیدی نیە١٣٩.

ئەم تێزەی خەواریج پێچەوانەی شیعەکانیش بوو کەخەلافەتیان گەمارۆ دابوو لەبنەماڵەی پێغەمبەردا. خەواریج تێزەکەی خۆیان بەعەمەلی جێ بەجێ کرد، بەوەی کاتێك عەبدوللای کوڕی وەهبیان کردە ئەمیری موسڵمانان و لە قورەیشیەکان نەبوو.١٤، ئیتر خەواریج بە درێژەدان بەم بۆچوونەیان بەدرێژایی مێژووی ئومەوی و عەباسیەکانیش بوونە هێزی بەرهەڵستکار.

وەك باسکرا بیروڕای خەواریج لە گۆڕاندا بوو، ئەویش بەپێی کات و شوێن، ئەوەبوو لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لەساڵی ( ٦٥-٨٣ك / ٦٨٤- ٧,٢ز ) بزووتنەوەی خەواریج تەنها جووڵانەوەیەکی سیاسی نەبوو، چونکە بەرەبەرە لەگوتاری سیاسیەوە تێکەڵی بیروباوەڕی ئاینی بوون، ئیدی خەواریج لە نێوەندی خەڵك و لایەنگرانیدا وەك مەزهەبێت سەیر دەکرا، ئەم شێوازەش لە گروپی ئەزاریقەدا بەڕوونی و بەتەواوی ڕەنگی دایەوە ١٤١.

یەکێکی تر لەبیروباوەڕەکانیان بریتی بوو لە تیۆری کارکردن بەشێکە لە باوەڕ، ئەمە بۆچوونێکی تریان بوو، پێیان وابوو ڕاستگۆیی، نوێژ، ڕۆژوو، دادپەروەریی، هەموو ئەمانە بەشێکن لە ئیمان، ئیمانیش تەنها بڕوا بوون بەخوا نیە، بەوەی بوترێت ( لااله الا الله محمد رسول الله)، بەڵکو پێویستە کردەوەش بوونی هەبێت، ئەگینا ئیمانی بێ کردەوە، مرۆڤ بەرەو کافربوون و گوناهی گەورە دەبات. هەروەها پێیان وابوو پێویستە لە دەسەلاتی ستەمکار دەربچن و ڕووبکەنە ( دار الاسلام)١٤٢.

ئەوان لە بۆچوونەکانیاندا تەکفیری هەریەك لە عوسمان و عەلییان دەکرد، پێیان وابوو هەموو ئەوانەش هەستان بەناوبژیکردن کافرن، بۆنمونە بەتوندی موعاویەو ئەوانەی لە شام لەگەڵی بوون هەموویان بە دەرچوو لە ئاین قاودران١٤٣.

## باسی چوارەم:

## دەستپێکی جەنگەکانی خەواریج و دەوڵەتی ئیسلامی.

### ١. جەنگی نەهرەوان و شەهید کردنی عەلی و بڵاوبوونەوەی خەواریج : ـ

پاش ئەوەی خەواریجەکان کۆبوونەوەو بەڵێنیان دا بە عەبدوڵلای کوڕی وەهبی ڕاسبی١٤٥، ئیتر هەرێمی نەهرەوانیان کردە بنکەی جموجووڵی بزوتنەوەکەیان و سوپایەکی چەکداریان پێک هێناو دەستیان کرد بە خراپەکاری و ڕشتنی بەناهەقی خوێنی موسوڵمانان و بردنی سەروەت و سامانیان و حەڵاڵکردنی ماڵیان١٤٦. لەبەرامبەردا خەلیفە عەلیش پاش هەوڵدانێکی زۆر بۆ گەڕانەوەیان بۆ ڕیزەکانی خەلافەت بێ هیوابوو، دوواجار بڕیاری جەنگیدا لەگەڵیان و بە لەشکرێکی سازدراوەوە دەرچوو بۆ نەهرەوان. بەڵام پێش دەسپێکردنی جەنگ و سەرەتا دەستیکرد بەوتووێژێکی دوورو درێژو لۆژیکی لە گەڵیان. ئەوەبوو لە ئاکامدا زۆرینەیان هاتنەوە ڕیزەکانی دەوڵەت، بەجۆرێك تەنها هەزار کەسێك لەدەوری سەرکردەکەیان مانەوە، ئیتر جەنگ لەنێوانیاندا ڕوویدا، ئەم جەنگە یەکەم جەنگی خەواریج و خەلافەت بوو، سەرئەنجام لەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا زۆرینەی خەواریج بە سەرکردەکانیشیانەوە کوژران، لەوانە هەردوو عەبدوڵلاو حەرقوسی کوڕی زوهەیری سەعدی کە بەشداری کوشتنی عوسمان بوون و لەپێشەنگەکانی بزافی خەواریج بوون١٤٧.

ئەم جەنگە کاریگەریەکی تەواوی کردە سەرخەواریج، هەرکاردانەوەی ئەم جەنگەبوو لە ساڵی ( ٤٠ك– ٦٦٥ز ) سێ لە خەواریجەکان کۆبوونەوە لەوانە :عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلجەم و بەرکی کوڕی عەبدوڵلای تەمیمی و عەمری

کوڕی بەکری تەمیمی، ئەمانە هەرسێکیان لە تۆڵەی کوژراوانی جەنگی نەهرەوان بڕیاری کوشتنی هەریەك لەپیاوانی دەوڵەتی ئیسلامیاندا کە عەلیو موعاویەو عەمر بوون، بڕیارەکەش لەنەخشەیەکی بۆ داڕێژراودا پێویستبوو لە یەك کاتو ساتدا ئەنجام بدرێت، کە دیاریکردنەکەش ( ١٧ )ی ڕەمەزانی نوێژی بەیانی بوو١٤٨، ئیتر هەریەك لەوانە پێویستبوو لەو کاتەدا لە دیمەشقو میسرو کوفەوە کارەکانیان بۆ کوشتنی ئەوانە ئەنجام بدەن. وەلێ هەریەکێکیان هەستا بە جێبەجێکردنی پلانەکەی. ئەویش عەبدولڕەحمانی کوڕی مەلجەم بوو، کەتوانی بە شمشێرەکەی لە عەلی بداو شەهیدی کرد. ناوبراو لەکاتی شاڵاوەکەیدا بۆ سەر خەلیفەی موسڵمانان هاواردەکات: "عەلی حوکم تەنها هەربۆخودایە، نە بۆ تۆیەو نە بۆ هاوەڵانت" ١٤٩٨.

ئیتر عەلی پاش بریندار بوونی شەهید دەبێت، بەلأم عەمرو موعاویە ڕزگاریان دەبێت لە پلانەکە. بەمجۆرە جەنگی نەهرەوان کاریگەری قوڵو بەهێزی لە سەر خەواریج هەبوو. بەجۆرێك (نیکسۆن) لەوبارەوە دەڵێ: "جەنگی نەهرەوان بۆ خەواریج وەك ڕووداوی کەربەلا وابوو بۆ شیعەکان"١٥. هەندێکیش لە ڕۆژهەلاتناسان پێیان وابوو خەواریج وەك مارێك وابوو، کە لەو جەنگەدا پێکراو بەلأم نەکوژرا. ئەوەبوو جەنگی نەهرەوان ( ٣٨ك ٦٦.ز) بوو بەهۆی وروژاندنی دەمارگیریی ئاینیی تەواوی هەوادارانی خەواریج لە بەسرەو کوفەدا ١٥١. ئیتر بەشێوەیەکی نهێنی لەوێوە جموجوڵێکی نوێ دەستی پێکرد١٥٢. هاوکات ئەوانەیش لە جەنگەکەدا ڕزگاریان ببوو ڕوویان کردە ناوچەکانی عومانو هەرێمی جەزیرەو سەجستانو یەمەن، ئیتر بزووتنەوەکە لەوێوە بۆچوونی جیاوازوو مەزهەبی تایبەت بەخۆیان درووست کردوو بەدرێژای مێژووی ئومەویەکان بوونە مایەی کێشەو دەردی سەری بۆ سەر دەسەلأتی ناوەندیی خەلافەت، هەروەها بوونە زەمینەیەکی لەبار بۆ خڕبوونەوەی بەرهەڵستکارانی ناعەرەب لەتەکیانو بەمەش زێدەتر پەرژایان تا ئاسایشی دەسەلأتیی ملهوڕی خەلافەت بخەنە مەترسیەوەو سەرکۆنەی لادانەکانی بکەن١٥٣.

٢. خەواریج لە سەردەمی دەوڵەتی ئومەویەکاندا :-

پاش ئەوەی حەسەنی کوڕی عەلی لە دەسەلات دا نەرمی نواند بۆ موعاویەو ڕێك کەوتن لەسەر ئەوەی موعاویە لەدووای عەلی ببێت بە خەلیفەی موسڵمانان. موعاویەش وەك ئەوەی بنەماڵەیەکی ڕەسەنی عەرەب، تەماو شانازی ئەوەی لا دروست ببوو، کە هەرلە سەردەمی پێش ئیسلامەوە ڕۆڵێکی گەورەیان لەناو قورەیشدا هەبووە، ئیتر ئەو ئەرکەی بەمافی خۆی زانیو گرتیە ئەستۆی خۆی، ئەو تا ئەوکات ماوەی بیست ساڵ والی وولاتی شام بوو١٥٤، بەمەش دەسەلاتێکی ڕەهای لە ناوچەکەدا بۆ دروستببوو، بەجۆرێك توانی بەبڕیارێك تەراتێن بە پرەنسیپە بەراییەکانی دەستووری ئیسلامی بکات. ئەمەش بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی کە خۆیو بنەماڵەکەی لە وولاتی شامدا بێ کێشەو بێ قرەو مشە بوو. بەلام سەبارەت بە بزووتنەوەی خەواریجەکان هەرلەسەرەتاوە لە خەلیفە بوونی نارازی بوون، چونکە ئەویش بەشێك بوو لە رازیبووانی پرۆژەی تەحکیمو گرەوی لە ململانێکاندا بردبووەوە، هەربۆیە لە دیدی خەواریجدا تەنها شمشێر لە بەینی ئەوانو موعاویەدا بوونی هەبوو١٥٥، لە بەرئەوە یەکەمین کاردانەوەشیان دژی موعاویەو دەسەلاتگرتنە دەستی بە ناڕەوا. دەرچوونی فەروەی کوڕی نەوفەلی ئەشجەعی بوو بۆ هەرێمی شارەزوور١٥٦، فەروە لەتەك پێنج لە سەرکردەکانی تری خەواریج لە شارەزوورەوە دەستیان کرد بەخۆ ڕێکخستنو هەڕەشەکردن لە دەوڵەتی تازە ڕاگەیەنراوی ئومەوییەکان.

بەشێوەیەکی گشتی خەواریجەکان بەدوو ئاراستە بلاو بوونەوە

یەکەم: ئاراستەی یەکەمی خەواریج بۆعێراقو دەورووبەری بوو کە مەڵبەندەکەیان لەشوێنێك بوو نزیکی بەسرە بەنێوی بەتائیح، ئەم ئاراستەیە لە دواییدا دەستیان بەسەر کرمانو هەرێمی فارسدا گرت، بەناو بانگترین سەرکردەیان لەم بەرەیەدا بریتی بوو لە نافعی کوڕی ئەزرەق١٥٧.

دووەم: ئەم ئاراستەیە ڕووەو جەزیرەی عەرەبی بوو، لەوێدا دەستیانگرت بەسەر یەمامەو حەزرەمەوتو یەمەنو ئائیف، گرنگترین سەرکردەکانیش بریتی بوون لە ئەبو تالوتو نەجدەی کوڕی عامرو ئەبو فدیك ١٥٨.
لەبەرامبەریشدا کاردانەوەی ئومەویەکان نەیانتوانی بەسەر ئەم دوو لقەدا زاڵ بن. بەجۆرێك کە بەدرێژایی ماوەی دەسەلاتیان بوونە مایەی دەردی سەری بۆیان١٥٩.
دیارە تەواوی شۆڕشەکانی خەواریج دژی ئومەوییەکان (٤٠-١٣٢ك/ ٦٦٠-٧٤٩ز ) لەسەر ئەو بنەمایە بوو کە دژی دەمارگیری قورەیشن لە سەرداریێتیدا، ئەمەش بەشێك بوو لەبیروباوەڕی خەواریجەکان، چونکە ڕۆحی بنەماڵەی ئومەوی دەمارگیری بوو بۆ قورەیش.١٦٠، بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییەش تەواوی ئەو شۆڕشانەی کە ڕوویانداوە لە هۆزە دەمارگیرەکانی دژە قورەیشەوە ڕابەرایەتی کراون، بەم شێوەیەی لای خوارەوە :
شۆڕش ( حوپرە بن وداع بن مسعود ) لەساڵی (٤٠ك/٦٦٠ز) لە هۆزی (اسد ).
- (مستورد بن علف) لەساڵی (٤٣ك/ ٦٦٠ز) لە هۆزی (تمیم ).
- ( زفاف الطائی) لە ساڵی ( ٥٩ه ٦٧٨ز ) لە هۆزی(طی).
- (قریب بن مره) لەساڵی ( ٥٠ه / ٦٧٠ز ) لە هۆزی (ازد) .
- (صیان بن زیبان سلمی) لە ساڵی ( ٥٩ك/ ٦٧٨ز) .
- ( ابو بلال مرداس) لەساڵی (٦١ك/ ٦٨٠ز ) لە هۆزی (تمیم ).
- (نافع بن ازرق) لەساڵی ( ٦٥ك- ٦٨٤ز) لە هۆزی (بکر بن وائل) .
- ( عبدالله بن بشیر) لەساڵی ( ٦٥ك/ ٦٨٤ز) لە هۆزی (تمیم) .
- (زبیر بن علی) لە ساڵی ( ٦٨ك / ٦٨٧ز) لە هۆزی (تمیم) .
- (نجدە بن عامر) لە ساڵی ( ٦٩ك/ ٦٨٨ز) لە هۆزی (بکر بن وائل) .
- ( عبدالله بن یحی بن اسود) لەساڵی ( ١٣٠ك/ ٧٤٧ز ) لە هۆزی ( کندی)١٦١.
ئەمانە هەمووی لە عەرەب بوونو قورەیشی نەبوون، لەگەڵ ئەمەشدا نا ئارامیەکی تەواو باڵی بەسەر ڕۆژهەلاتدا کێشابوو، لە هەموو شوێنێ بزووتنەوەی خەواریجی دژ بە ئومەوی سەری هەڵدابوو، بزووتنەوەکان زۆرجار

بەناوی گەڕانەوە بوون بۆ سەرەتاکانی ئیسلام و بانگەشەی یەکسانی نێوان نیکڕای رەگەزو گروپە ئتنیکیە جیاوازەکانیان دەکرد، لێرەشدا بەشداریکردنی مەوالییەکان لە ناو خەواریجدا ڕوویەکی دیاری بزووتنەوەکان بوون١٦٢.
بەجۆرێك لە کۆتایی سەدەی حەوتەمو سەرەتای سەدەی هەشتەم بەتەواوی دروشمی خەواریج ( نا بۆخەلافەت لە دەرەوەی ویستی خوداو گەل )، چەندین خەڵکی ئاراستە جیای لە دەوری خۆی کۆکردەوەو خوازیاری بنچینەیەك بوون بۆ یەکسانی نێوان کۆمەڵ١٦٣. گرنگترین کاردانەوەیەکی توندو کاریگەری ئومەوییەکان بەکاریان هێنابێت دژی هێزی خەواریجو بۆ ڕزگاربوونیان لە مەترسی لەناو چوون، بریتی بوو لە سەردەمی بوون بە والی هەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، ئەم پیاوە کەسایەتیەکی توندوتیژو سەربازیی بەهێز بوو، ئومەوییەکان لەساڵی (٧٤ك/ ٦٩٣ز) کردیانە والی عێراق١٦٤. ئەویش ئەرکی ڕووبەڕوو بوونەوەی بزاڤی خەواریجی لە دەسپێکی کارەکانیدا دانا، ئەوەبوو زۆر دڵڕەقانە هێزی خەواریجی سەرکوت دەکرد، بەمجۆرە بە درێژای سەردەمی دەسەڵاتی ئومەوی تاکە ئارامییەك ڕووی دابێت لەگەڵ خەواریج، بریتی بوو لە سەردەمی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ( ٩٩-١,١ك/ ٧١٧ - ٧١٩ز). ئەو یەکێك بوو لەو خەلیفە لیبراڵو ئیسلام دۆستانەی داوای گفتوگۆی دەکردوو باجو سەرانەی لەسەر ناعەرەبەکان لادەبرد.
مامەڵەی ئەم خەلیفەیە لەڕێگەی هێزوو زۆرەوە نەبوو، بەڵکو ئامادەیی پیشاندانبوو بۆ گوێگرتن بۆ داواکارەکانی خەڵکی تووڕەو بەرهەڵستکاری خەلافەت ١٦٥. بەڵام بەگشتی ئەم هەوڵانەی ئومەوییەکان بۆ ڕزگاربوونیان لە فشاری تووڕەیی و هاواری گەلانی بن دەستو جووڵانەوە رزگاریخوازەکان لەلایەکەوە کەم بوون، لە لایەکی تریشەوە درەنگ وەخۆکەوتن .

## پەراویزەکانی بەشی یەکەم

*مەبەست لەو سەرپێچیکارانە هۆزە عەرەبیە هەڵگەڕاوەکان بوون، وەك هۆزی (حنیفە) کە سەرکردەکەیان موسەیلەمەی کوڕی حەبیبە بوو، لەگەڵ هۆزی تەمیم کەسەرکردەکەیان سەجاجی کوڕی حارس بوو.

١. الاسفرايني: التبصير فى الدين، تحقيق محمد الكوسرى، مكتبه الخانجى، مصر، ١٩٥٥ ، ل ٢٥.

* ئەبو بەکر ناوی عەبدوڵڵای کوڕی قوحافەی کوڕی عوسمانی تەمیمیە، یەکەم خەلیفەی ڕاشیدینەو لەشاری مەکەدا لە دایك بووە (هەمان سەرچاوە، ل ٢٥)

٢. الطبري: تاريخ الرسل والملوك، تحقيق ابو فضل ابراهيم، ت٢، دارالمعارف القاهرة، ج ١، ل٣٣٨.

٣. ابن كثير: البداية والنهاية، ت١، دارالمعارف، بيروت، ١٩٦٦، ج٥، لا ٢٢٧ — ٢٢٨ .

٤. ابن كثير : البداية والنهاية، ج٥، لا٢٤٥– ٢٤٧ .

٥. وەرگیراوەلە ( صلاح عبد الفتاح الخالدى: خەلیفەکانی ڕاشدین لەنێوان جێنشین بوون و شەهید بووندا، وەرگێڕانی فاتیح سەنگاوی، چاپخانەی نازە، هەولێر، ٢٠٠٢ ز، لا٦٧.

٦. هەمان سەرچاوە لا ٦٨–٦٩ .

٧. صلاح عبد الفاتح الخالدى: خەلیفەکانی ڕاشیدین لەنێوان جێ نشین بوون و شەهید بووندا، لا ٦٤.

* خوای گەورەش ئاماژە بەمجۆرە موسوڵمان بوونە دەکات لەسەردەمی پێغەمبەردا دەفەرموێت ( اذا جاء نصرالله والفتح ورايت الناس يدخلون في دين الله افواجا فصبح بحمد ربك واستغفرة انة كان توابا ) قورئانی پیرۆز سورەتی (النصر) .

٨. السيوطي : تاريخ الخلفا، تحقيق محمد محي الدين عبدالحميد، ت ١، دار القلم، بيروت، ١٩٨٦، لا ٦٩ .

٩. ابن العربي: العواصم من القواصم، تحقيق محي الدين الخطيب، ت٢، دار الحبيل، بيروت، ١٩٨٧، لا٣٣.

١٠. ابن العربي: العواصم من القواصم، لا٣٣.

١١. ابن كثير: البدايةوالنهاية، ج٧، لا١٨٥ .

* جەنگی جەمەل لەمانگی جەمادی دووەمی ساڵی (٣٦ك، ٦٥٦ن) لەناوچەی (زابوقە) نزيك بەسرە ڕوویدا، جەنگەکە لەنێوان عەلی لەلایەك و عائیشەو زوبێر لەلایەکی تربوو،

سەرەنجام عەلی لەجەنگەکەدا سەرکەوتنی بەدەستهێنا : ( الطبري: تاريخ الرسل والملوك، ج٤، لا٦١,٥-٥,٧" ابن كثير: البدايةوالنهاية، ج٧، لا٢٤٩) زیانەکانی ئەم جەنگە کوژرانی ١٣هەزار موسولمان بوو لەگەڵ شەهیدبوونی هەردوو هاوەڵی پێغەمبەر تەلحەی کوڕی عوبەیدوللاو زوبەیری کوڕی عەووام :( السيوطي: تاريخ الخلفا، لا١٧٤) .

* ململانێ لەنێوان خەلیفەکاندا پەیدابوو بوو، بەجۆرێك هەریەکەیان هەواداری بەرەی لەنێوان موسولماناندا بۆخۆی جیا کردبویەوە، ئەم ڕاستییە لەسەنەدێکی دروستەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، کە دەڵێ لە موعاویەیان پرسی تۆ لەسەر میللەتی عوسمانی یاخۆ عەلی ؟ ئەویش وتی هیچ کامیان، بەڵکو لەسەر میللەتی پێغەمبەرم : ( ابن تيمية: الوصية الكبري، تحقيق علي حسن علي، مكتبة السراس، بغداد، ١٩٩٥ز، لا ٣٤).

* ئەم جەنگە لە مانگی سەفەری ساڵی ٣٧ك، ٦٥٧ز دا دەستپێکرد لەنێوان لەشکرێکی ١٢. هەزار جەنگاوەر لە لایەنگرانی عەلیو لە بەرامبەریشدا لەشکرێکی نەوەد هەزار جەنگاوەری موعاویەدا، جەنگەکە لە سەفین بوو لەسەر ڕووباری فورات، ئەم جەنگە دوای کوژرانی دەیان هەزار لە هەردوولا بەمەسەلەی (تحكيم) کۆتایی پێهات: ( ابن كثير: سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ٢٥٦-٢٥٨).

١٢. المسعودي: مروج الذهب ومعادن الجوهر، دار الاندلس، بيروت، ١٩٦٥، ج٢، لا٤,٣" ابن كثير: سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ٢٢١ .

١٣. نايف معروف : الخوارج في العصر الاموي، ت ٤، بيروت، ١٩٩٤، لا١٤" فوئاد مەجید میسری: بیری ئوسوڵی ئیسلامی، سلێمانی، ٢٠٠٢، لا٤.

١٤. عبدالله حماد: التكفير في فكر الخوارج، مجله النهج، العدد ٢٧، ٢٠٠١، لا٤٩ .

١٥. نايف معروف: الخوارج في العصر الاموي، لا١٤" موسلح مصطفي جەلالی: شوراتەکان، مكبعه بغداد، ١٩٨٦، لا ٥١ .

١٦. ابن حجر العسقلاني: فتح الباري ( شرح صحيح البخاري)، ت ١، دار الفكر، بيروت، ١٤٢٠- ٢٠٠٠م، مج ١٤ لا ٢٩٥-٢٩٦ .

١٧. ابن الاثير: الكامل في التاريخ، تحقيق مكتبة السراس، ت ١، بيروت، ١٩٨٩، ج ٣، لا١٥٥ .

١٨. مسلم بن الحاج، صحيح المسلم، شرح النووي، ٧، ١٦٧" البخاري، صحيح البخاري، شرح بن حجر، ٩، ١٣..

١٩. ابن الجوزي، تبليس ابليس، دار الرائد العربي، بيروت، ١٣٦٨، لا٩٧ .

٢٠. موسلح مصگفی جەلالی : شوراتەکان، لا٧٣ .

* ابوسعيد الخدري: یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەرو لە پشتیوانەکانی مەدینەیە، کە توانیویەتی زۆرێك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بیگێڕێتەوە، چونکە لە نزیکو

جێباوەڕەکانی پێغەمبەر بوو :( محمد التمان: تیسیر المصطلح الحدیث، المطبعة السلفة، کویت، ١٩٨٦، لا ١٥٨.

٢١. ابن الاثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٥٤٥" ابن کپیر، سەرچاوەی پێشوو، ج ٧، لا ٣٠٠- ٣,١ " نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٧.

٢٢. ابن کثیر، هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٧٩ .

٢٣. نایف معروف، سەرچاوەی پێشوو،لا ١٥.

٢٤. هەمان سەرچاوە، لا ٦، موصلح جەلالی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٤.

٢٥. ابن الاثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٥٤٥ .

٢٦. ابن الاثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٥٤٥.

٢٧. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢. .

* خودای گەورە دەفەرمێت: ( یاایها الذین امنوا انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند اللة اتقاکم ) قورئانی پیرۆز :سورەتی (الحجرات)، ئایەتی ١٣" هەروەها پێغەمبەری خوداش دەفەرموێت: (من دعی الی العصبیه فلیس منا، ومن مات علی عصبیه فلیس منا)" واتە ئەوەی بانگەشەی دەمارگیریی بکات لە ئێمە نییە، ئەوەی لەسەر ئەو باوەڕە بمرێ لە ئێمە نییە: ( مسلم بن الحاج: صحیح المسلم، شرح نووی، ٧، ١٦.).

٢٨. علي الوردي: منطق ابن خلدون، ت ١، انتشارات مکتبة الحیدریة، قم المقدس، ١٩٩٧، لا ٨٣.

٢٩. عەتا قەرەداغی: کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد، چاپی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠١ لا ٢٤٥ .

٣٠. ابن خلدون: المقدمه، دار الکتاب المصری والکتاب اللبنانی، القاهره، ١٩٩٩ ز، ج ٢، لا ٤٤٨.

٣١. علی الوردی :سەرچاوەی پێشوو، لا ٨٣" هاملتون جب: اسلام بررسی تاریخ، ترجمه منوچهر، چاپخانه اتش، لا ١٤١.

* زۆربەی عەرەبە دێهاتیو بیابان نشینەکان لە عەرەبە شارنشینەکان دڵ ڕەقترن، لەبەرئەوە ئەوان لەبارەی کوفرو دووڕوویەوە گونجاوترن بۆ شکاندنی ئەو سنورانەی کە خوا بۆ پێغەمبەری دیاری کردوون : ( بورهان موحەمەد ئەمین: تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، چاپی پێنجەم، هەولێر، لا ١٩٥،

٣٢. قورئانی پیرۆز: سورەتی ( التوبە) ئایەتی ٩٧.

* موسەیلمە ناوی موسەیلەمەی کوڕی حەبیبەیەو سەرکردەی هۆزی حەنیفەیە، پاش ئەوەی موسڵمان دەبێت، لەسەردەمی ئەبوبەکردا هەڵگەڕایەوەو زەکاتی نەدەدا، دواتر

بانگەشەی پێغەمبەرایەتی دەکرد، سەرەنجام لە جەنگێکدا بەدەستی وەحشی کوژرا: ( صلاح عبدالفتاح الخالدی: خەلیفەکانی ڕاشیدین، لا ۷۰).
٣٣. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤.
٣٤. البلاذري: انساب الاشراف، تحقیق الشیخ محمد باقر المحمودي، موءسسة الاعلمي، بیروت، ١٩٧٤، ج ٥، لا ٤٠.
٣٥. موصلح مسطفی جه لالي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢.
* عەبدوللاَّ کوڕی عەباس کوڕی عەبدولمتەلیبی مامی پێغەمبەرەو لەنەوەی هاشمی کوڕی عەبدو لمەنافی قورەیشییە، دایکی ناوی (ام الفچل)هو یەکێکە لەگێڕەرەوانی فەرمووده :( سالم الشیرة: من مشاهیر المفسرین، الرسالة الاسلامیة، المجلة الاسلامیة، العدد ٢٥٧–٢٥٨، السنة السادسة، ١٩٩٢، لا٤٨.
٣٦. ابن کثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٧، لا ٢٧٦ .
٣٧. هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٧٦.
٣٨. وەرگیراوە لە : ( نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، ٢٦).
* ئیبن خەلدوون پێی وایە بۆیە پێغەمبەر ئاماژەی داوە خەلافەت لە قورەیش بێت، چونکە قورەیشییەکان لەدوورگەی عەرەبیدا خاوەنی دەمارگیرییەکی گەورە بوون، ئەگەر وانەبوایە بارودۆخ ئارام نەدەبوو، بۆیە داواشی نەکردووە جگە لە قورەیش خەلیفە بێت تەنها بۆ پاراستنی یەکێتیو ئومەی ئیسلامی بووە، بڕوانە : ( علی الوردی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٤).
٣٩. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا٣٩٧.
٤٠. هەمان سەرچاوە، لا ٤٦.
٤١. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٧–٢٨.
٤٢. الطبری : سەرچاوەی پێشوو، ج ٥، لا ٥٢.
٤٣. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو لا ٢٨.
٤٤. ابراهیم حرکات: المجتمع الاسلامي والسلطة في العصر الوسیط، مطبعة، افریقا الشرق، المغرب، ١٩٩٨، لا ١٨٤
٤٥. نایف معروف، سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٥ .
٤٦. الگبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٣، لا ٤،١" صلاح عبد لفتاح: سەرچاوەی پێشوو، ١٢٤
٤٧. الطبری: سەرچاوەی پێشو، ج ٣، لا ٤،٥ .
* هێزی دژ بە خەلافەت هەر لە سەرەتاوە بوونی هەبووە، بەلاَم تاوەکو دوای سەردەمی عومەری کوڕی خەتاب زەمینەیان بۆ نەڕەخسا، ئەو لەبەردەم ئەو هێزەدا وەك

دەرگایەکی داخراو دروست کرابوو، بەهیچ شێوەیەك بواری هاتنە ژوورەوە نەبوو بۆ نەیاران، بەڵام شەهید کردنی عومەر لە پیلانێکی هاوبەشی ( هورمزان: کە پادشای ئەهواز بوو، دوای فەتح بەدیلی هێنرابوویە مەدینە، لەگەڵ کەعب ئەحبار کە یەکێك بوو لە زانا جولەکەکانو لە مەدینەدا دەژیاو خەڵکی یەمەن بوو، لەگەڵ ئەبو لوئلوئی فەیروزیدا کە بەدیلی لە جەنگی فارسدا گیرابوو وەدواتر بوو بوویە بەندەی ( مغیرە بن شعبە)، هەروەها جوفەینەش وەکو کۆیلەیەکی مەسیحی، هەموو ئەمانە لەو پیلانە هاوبەشەدا بەشدار بوون، ئەوەبوو سەرەنجام لە پیلانەکەدا سەرکەوتن، دیارە پیلانێکی لەو جۆرە بەڵگەی بوونی هێزێکی بەرهەڵستکاربوو لە ناو دەوڵەتدا، ئیتر لە سەردەمی عوسماندا لە شێوەو ڕواڵەتی جیاجیادا بەتەواوی پەرەیان سەند ( صلاح عبد الفتاح الخالدی: خەلیفەکانی ڕاشیدین، لا ٨٢–٨٩ ).

٤٨. ابن کثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ١٩٧.

٤٩. هەمان سەرچاوە، ج ٤، لا ١٩٧.

٥٠. صلاح عبدالفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٧.

٥١. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج ٣، لا ٢٧٩.

٥٢. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا٥٦.

٥٣. المسعودی:سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٤,٤.

٥٤. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ٣٤. .

٥٥. صلاح عبدالفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣٥.

٥٦. هەمان سەرچاوە، لا ١٤٦.

* سەبارەت بەو تێڕوانینەی عەبدوللای کوڕی وەهب ئەوە یەکەم گوتارە کە ئیمامەتی عەلی دەسەپێنێ، هەربۆیە ئەوانەی لە دژی شیعەن پێیان وایە کە شیعە لە سەرەتاوە لە یەهودیەتەوە وەرگیراوە، چونکە ئەم بۆچوونەی عەبدوللا لە سەرەتاشدا کە جوولەکە بوو دەیوت دەبێ (یوشع بن نون) بووایە بە جێگرەوەی موسا، هەربۆیە کە موسوڵمانیش بوو دەیوت دەبێ عەلی جێگیریی پێغەمبەر بێت، بەڵام دیارە مەبەستەکەی تەنها ڕووکەش بوو (صائب عبد الحمید : تاریخ الاسلام، الثقافی والسیاسی، ت ١٩٩٧، لا ٥٨٤ ).

٥٧. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ٢٤٤ .

٥٨. صلاح عبدالفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا١٤٦.

٥٩. ابن کثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا٢,٤٤

٦٠. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا٣٥٣ .

٦١. محمد صادق العرجون: عثمان بن عفان، ت ٢، بیروت، ١٩٨٩، لا ١١٧ .

٦٢. صلاح عبدالفتاح خالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٨٧ .
* نەسیبین یەکێکە لە شارەکانی هەرێمی جەزیرەو بەبنکەی دەفەری هۆزی (ربیعە) دادەنرێ، چیای جودی دەکەوێتە باکوریەوەو شارەکەش دەکەوێتە باکوری سنجار : (فائزه محمد عزت: الکردفی اقلیم الجزیره وشهرزور فی صدر الاسلام، رساله ماجستیر غیر منشوره، کلیه الاداب، جامعه صلاحدین، ١٩٩١، لا ٤٧).
٦٣. کورت فریشلر: گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام، وەرگێڕانی حەمەی حەمە سعید، سلێمانی، ٢٠٠٣، لا ٥,١.
٦٤. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٦.
٦٥. صلاح عبدالفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٤.
٦٦. المسعودی : سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، ٤,٤.
*عەمری کوڕی عاس یەکێکە لە هاوەڵانی پێغەمبەر و لە سەردەمی عەلیدا والی میسر بوو، بەڵام ئەویش لە خەلافەتی عەلی دەرچوو، ئەوەبوو لەبەرەی موعاویەدا ئەویش خوازیاری سەندنی خوێنی عوسمان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا سەرکردەیەکی سیاسی زۆر بە توانا بووەو جێگای ڕاوێژی موعاویە بوو : ( ابن کثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٧، لا٢١٣ – ٢١٥.
٦٧. هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٧٧ .
٦٨. احمد امین: فجر الاسلام، ت ١٠، بیروت، ١٩٦٩، لا ٢٥٦ .
٦٩. کارل بروکمان: تاریخ الشعوب الاسلامیه، ت٨، بیروت، ١٩٧٩، لا١٤٣.
٧٠. هەمان سەرچاوە، لا ١٤٣.
٧١. عمر ابو نصر: الخوارج في الاسلام، الطبعة الجديدة، بيروت، ١٩٥٦، لا ٩ .
٧٢. ابن کثیر:سەرچاوەی پێشوو، ج ٧، لا ٢٧٧.
٧٣. هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٧٧.
٧٤. هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٧٧ .
٧٥. الشهرستانی: الملل و النحل، ت ٧، بیروت، ١٩٩٨، ج ١، لا ١٥٧" البغدادی، الفرق بین الفرق، ت ٢، بیروت، ١٩٧٧، لا ٤٦١.
٧٦. عبد النعم الحسنی: الفرق والجماعات والمذاهب والاحذاب و الحرکات الاسلامیة، بیروت، ١٩٩٩، لا ٣٣٣.
٧٧. عمر ابونصر: سەرچاوەی پێشوو، ١٩٥٦، لا ١٠.
٧٨. محمد عماره: الخلافة ونشاة الاحذاب الاسلامية، ت ٢، بغداد، ١٩٨٤، لا ١٤١.
٧٩. صلاح عبد الفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣,١.

٨٠. لبيد ابراهيم احمد وابراهيم نمير سيف الدين، عصرالنبوه والخلافه الراشده، ت ٢، الربات، لا ٣٢٧" عبدالله حماد، التكفير والهجره، العدد ٢٧، لا ٤٨.

٨١. الطبرى: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ٣٦.

٨٢. مصلح مسگفی جەلالی، هەمان سەرچاوە، لا ٩٧.

٨٣. هەمان سەرچاوە، لا ٩٧.

٨٤. الخربوگلی: تاريخ العراق في ظل الحكم الاموي، ت ٢، مصر، ١٩٥٩، لا ٥٩ .

٨٥. وەرگیراوە لە هەمان سەرچاوە، لا ٥٨.

٨٦. هەمان سەرچاوە، لا ٥٥ .

* جون کالڤنیەکان، ڕێبازی ئەمانە یەکێك بوو لە بیروباوەڕە پرۆسستانییەکان، کە لە ئەوروپادا لەساڵی ١٩١٧ ز لەسەردەستی جون کالڤن بڵاوبوویەوە، ئەم کەسایەتییە بەدووەم کەس دادەنرێت دوای مارتن لوسەر، کە لە کەنیسەی کاتۆلیکی جیا بوویەوەو کەنیسەیەکی نویّ ی دامەزراند، زۆربەی لایەنگرانی لە فەرەنسا بوون، ئەو دوواجار مەلیکی قایلکرد بە مەزهەبەکەیو باوەڕەکانی ڕەسمییەتیان وەرگرت :( محمد محمد صالح: تاريخ اورثا عصر النهضة، مكتبة دار الجاحظ، بغداد، ١٩٨١، لا ١٩٤ .

٨٧. عبد الجواد ياسين:السلگه ف الاسلام، ت ١، بيروت، ١٩٩٨، لا ٥٨ .

٨٨. عبدالله حماد: التكفير والهجره، النهج، العدد ٢٧، لا ٤٨" الزمخشرى: الفائق ف غريب الحديث، دار الاحيا الكتب العربية، القاهره، ( د.ت)، لا ١٧.

٨٩. محمد عبدالله عوده واخرون، مختصر التاريخ الاسلامى، ت ١، عمان، ١٩٨٩، لا ٧٧

٩٠. وەرگیراوە لە الخربوطلي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٠.

٩١. الشهرستانى : سەرچاوەی پێشوو، ج ١، لا ١٥٥.

* موعتەزیلە گروپێك بوون لەسەردەستی (واصل بن عگا) لەساڵی ٨٤٨ز لە حەسەنی بەسری جیابوونەوە، ئەمانە هەوڵیّ بوون بوّ دروستبوونی ئیسلامی سیاسی ئەو سەردەمەو دروست بوونیان لە ئاکامی نەرمی نواندن بو لە ئاستی توند ڕەویی خەواریج، ئەوان نە لە سەنگەری عەلی بوون نەدژی بوون، دواتر بوونە کۆمەڵێکی عەقڵانی و پێچەوانەی شیعەکانیش بوون لەمەسەلەی ئیمامەتا: (لويس غرديه ج قنواتي: فلسفه الفكرى الدين بين الاسلام والمسحيه، ت ٢، بيروت، ج ١، لا ٧٩.

٩٢. ڕێبین ڕەسول هەردی: سیستەمی سیاسی و هزرو فەلسەفەی سیاسی، چاپی یەکەم، سەردەم، سلیمانی، ٢٠٠٢ .

٩٣. احمد امين: فجر الاسلام، لا ٢٥٧.

٩٤. ابن خلدون: تاريخ ابن خلدون، بيروت، ١٩٧٩ز، ١,٧ .

٩٥. الشهرستانى: سەرچاوەی پێشوو، ج ١، لا ١٥٥.

٩٦. لبیر ابراهیم احمد :سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٥٣.

٩٧. قورئانی پیرۆز: سورەتی التوبە.

٩٨. صائب عبد الحمید: سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١..

٩٩. عبدالمنعم المغنی: موسوعە الفرق والجماعات، ت ٢، بیروت، ١٩٨٩، لا ٣٣٣

١٠٠. قورئانی پیرۆز: سورەتی التوبە، ئایەتی ١١ .

١٠١. صائیب عبد الحمید:سەرچاوەی پێشوو، لا ٦١..

١٠٢. البخاری: صحیح البخاری، شرح بن حجر، ٩، لا ٤٢١.

* واتەی فەرموودەکە، کۆمەڵێك خەڵك لە ئاخری زەمان لە ئومەتەکەم پەیدا دەبن تازە پێگەیشتوون نەفامن فەرموودەی پاکترین خەڵك کەپێغەمبەری خودایە دەڵێن، قورئان دەخوێنن، بەڵام لە قورگیان تێ ناپەڕێت، لەدین دەردەچن هەروەك چۆن تیر لە کەوان دەردەچێت، ئەگەر پێیان گەیشتن بیان کوژن بە کوشتنیان خودا پاداشتتان دەداتەوە .

١٠٣. قورئانی پیرۆز: سورەتی الحجرات، ئایەتی ٩.

* واتای ئایەتەکە بریتی یە لە: ئەگەر دوو دەستە یان دووتاقم لە موسوڵمانان بووبە شەریان ئەوە دەست بەجێ هەوڵ بدەن ڕێکیان بخەن و ئاشتیان بکەنەوە، خۆ ئەگەر لایەکیان هەر دەستدرێژی دەکردە سەر لاکەی تر، ئەوا ئێوە بەگژ ئەوەیاندا بچن کەستەم و دەست درێژی دەکات، تاوەکو دەگەڕێتەوە بۆفەرمانی خودا، جا ئەگەر لایەنە سەرکەشەکە بۆ فەرمانی خودا سەری دانەنەواند ئەوا ئێوە ناو بژیوانێکی دادگەرانە لە نێوانیاندا بکەن و دادپەروەری ئەنجام بدەن:( بورهان عومەر ئەمین: تەفسیری ئاسان، لا ٥٠٢).

١٠٤. عبد المنعم المغنی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٣٢.

١٠٥. هاشم معروف الحسنی: شیعەدر برابر، معتزلە و اشاعرە، تسعید محمد، چاپ سوم، تهران، ١٣٧٩، لا ٣٥.

١٠٦. احمد امین: سەرچاوەی پێشوو، ٢٥٩ .

١٠٧. عبدالله خلیفە: ڕەگوڕیشەی توندوتیژی لە ژیانی هاوچەرخی عەرەبیدا، ڕوانگەو ڕەخنە، وەرگێڕانی ئەمیر عبدالله، ژمارە ٤١٥، سلیمانی، ٢٧.ك، لا ٢٨٨

١٠٨. سید قطب: الخطاب والایدولوجیا، ت ١، دار الطلیعة، بیروت، ١٩٨٧، لا ٢٦

١٠٩. بەهەمەن تاهر نەریمان: کوردو ئیسلام، گۆڤاری ژیار، ژمارە ٥، هەولێر ٢٠٠٠، لا ٣٨

١١٠. وەرگیراوە لە هەمان سەرچاوە، لا ٣٩.

١١١. صبحي صالح، النظم الاسلامیة نشاتها وتطورها، ت ٢، لبنان، ١٩٩٢، لا ١٣٢.

١١٢. البغدادی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٥.

١١٣. الشهرستانی : سەرچاوەی پێشوو،

ج ١، لا ١٣٣ .

١١٤. الاسفرايني: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٦.

١١٥. هەمان سەرچاوە، لا ٤٦ .

١١٦. الشهرستاني: سەرچاوەی پێشوو، ج ١، لا ٢٣ .

١١٧. هەمان سەرچاوە، ج ١، ٣٦.

١١٨. الاسفرايني: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥١.

١١٩. هەمان سەرچاوە، لا ٥١" الشهرستاني: سەرچاوەی پێشوو، ج ١، لا ١٤١.

١٢٠. الاسفرايني: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٢.

١٢١. حسين الشاكري: نشواة المذاهب والفرق الاسلامية، ايران، ١٤١٨، لا ١٢..

١٢٢. الشهرستاني: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٦.

١٢٣. هەمان سەرچاوە، ج ١، لا ١٤٦.

١٢٤. هەمان سەرچاوە، ج ١، لا ١٤٦.

١٢٥. هەمان سەرچاوە، ج ١، ١٤٦.

١٢٦. محمد عبد الرحمن مرحبا: من الفلسفه اليونانيه الى الفلسفه الاسلاميه، ت ٢، بيروت، لا ٢٧٢.

١٢٧. هادی العلوی، فصول من تاريخ الاسلام السياسی، مركز الابحاث والدراسات الاشتراكية، ت ١، ١٩٩٢، بيروت، لا ٢٨٥.

١٢٨. الخربوطلي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٥.

١٢٩. وەرگیراوە لە هەمان سەرچاوە، لا ٦٥ .

١٣٠. ڕێبین ڕەسول ئیبراهیم: سیستەمی سیاسی، لا ١٥٧.

١٣١. محمد عماره: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤..

١٣٢. محمد علی ابوریان: تاريخ الفكر الفلسفی فی الاسلام، ت ٢، بيروت، ١٩٧٧، لا ١٥٤.

١٣٣. محمد نصر مهنا: علم السياسه، ت ٢، القاهره، ١٩٨٩، لا ٧..

١٣٤. هاشم معروف، شيعەدر برابر، معتزله واشاعره، لا ٣٥

١٣٥. الخربوگلی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٥، د. نایف معروف: الخوارج، لا ٢,٦.

١٣٦. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢,٧.

١٣٧. علی حسينی الخربوگلی: غروب الخلافه الاسلاميه، د.م، بيروت، ١٩٨٧، لا ٤٤.

١٣٨. علی الوردی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٩ .

١٣٩. محمد عبدالله عوده واخرون: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٧ " هاملتون جب: سەرچاوەی پێشوو، ١٩٢ .

١٤٠. المسعودی: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٢,٤.

١٤١. محمد نصر مهنا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤..

١٤٢. ڕێبین ڕەسول ئیبراهیم: سیستەمی سیاسی، لا ١٥٧.

١٤٣. محمد نصر مهنا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤. .

١٤٤. ڕێبین ڕەسول ئیبراهیم:سەرچاوەی پێشوو، لا " علی حسن الخربوطلي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤. .

١٤٥. المسعودی: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٤,٤.

*نەهرەوان ناوچەیەکی فراوانە لە نێوان بەغدادو (واسگ)دایە : (یا قـوت الحمـوی: معجم البلدان، ج ٥، لا ٣٤٢ ).

١٤٦. ابن کثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج ٧، لا ٢٥٧.

١٤٧. هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٢٨٨ – ٢٨٩ .

١٤٨ . هەمان سەرچاوە، ج ٧، لا ٣٢٦ .

١٤٩. صلاح عبد الفتاح الخالدی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢٥.

١٥٠. وەرگیراوە لە لگیفە بکاوی: حرکە الخوارج، ت ١، دار الفکر، بیروت، ٢٠٠١، لا ٤٩ .

١٥١. الخربوطلي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٧.

١٥٢. لطیفة البکاوي: سەرضاوةي ثيَشوو، لا ٤٩

١٥٣. لبید ابراهیم احمد و ابراهیم نمیر سیف الدین: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٢٨ .

١٥٤. لطیفة البکاوي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٧.

١٥٥. هەمان سەرچاوە، لا ٥٨.

١٥٦. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج ٥، لا ٣٢

١٥٧. احمد امین: سەرچاوەی پێشوو، ٢٥٧ .

١٥٨. هەمان سەرچاوە، ٢٥٨ .

١٥٩. محمد عمارە: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٤. .

١٦٠. هەمان سەرچاوە، لا ١٤..

١٦١. هەمان سەرچاوە، لا ١٤١– ١٤٢ .

١٦٢. نیکیتا ایلیسیف: الشرق الاسلامي في العصر الوسیط، ترجمة منصور ابـو الحسن، ت ٢، ١٩٨٦، لا ١٨١. .

١٦٣. هەمان سەرچاوە، لا ١٨١ .

١٦٤. نیکیتا ایلیسیف: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٨٢ .

١٦٥. کارل بروکلمان: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٥٠– ١٥١ .

## باسی یەکەم:

# سەرنجێکی گشتی دەربارەی شوێنی جوگرافی هەرێمە کوردیەکان

### یەکەم: هەرێمەکانی جەزیرەو موسڵ و شارەزوور :-

ئەم هەرێمانە لە سەردەمی ئومەویەکاندا بەشێك بوون لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیو هەر لە سەردەمی والی بوونی موعاویەدا لەو هەرێمانەدا لە شامو ناوچەکانی جەزیرەو ئەرمینیا لە ڕووی ئیدارییەوە خرانە ژێر دەسەلاتی خەلافەتو موعاویە بۆ ماوەی بیست ساڵ حوکمڕانی کردن١.

سەبارەت بەسنوری جوگرافی هەرێمی جەزیرە ئەوا ڕووبارەکانی دیجلەو فورات بە درێژایی تێپەڕبوونیان دادەنرێن بە سنووری هەرێمی شام لە ڕۆژئاوایەوەو سنووری هەرێمی چیاو ئازەربایجان لە ڕۆژهەلاتو باکوورییەوە، هەروەها سنووری باکووری هەرێمی جەزیرەش دیاری دەکرێت بەشاری هیت، کە بەکۆتایی هەرێمی جەزیرە دادەنرێت. شاری ئەنباریش یەکەمین شاری عێراقە لە دەروازەی جەزیرەدا٢.

هەندێکیش پێیان وایە باشووری هەرێمی جەزیرە کۆتایی دێت بەکۆتایی شاری تکریت لە سەر دیجلە لە ڕۆژهەلاتەوە و کۆتایی هیت لەسەر فورات لە ڕۆژئاواوە٣. لە باکووریشدا تا سنووری ئەرمینیا درێژ دەبێتەوە٤. ئەم هەرێمە لەسەرەتای ئیسلامدا بە (دیار مضر) ناسراو بووە، کە شارە

گرنگەکانیشی بریتی بوون لە: حران، رها، اورفە، راس العین، نصیبین، سنجار، خاپور، ماردین، امد، میا فارقین، موصل٥.

لە سەرچاوەکاندا ناوی ئەم شارانەش لە چوارچێوەی سنووری هەرێمەکەدا هاتووە کە بریتین لە : ارزن، سعرد، حصن کیف، فاقان، مدینە یمانین، جزیرە ابن عمر، زوران، جولمیرگ .٦ لەم هەرێمەدا موسڵو شارە پێوەندەکانی جێگایەکی دیارییان لە بزاڤەکانی خەواریجدا هەبووە، شارە پێوەندەکانیش بریتی بوون لەمانە:

١. موسڵ

شاری موسڵ گرنگییەکی ئەوتۆی هەبوو بۆ بنکەی بەڕێوەبەرایەتیو مەڵبەندیێ بوو بۆ کۆکردنەوەی باجو زەڕیبە، هەروەها بنکەیەکی سەربازیش بوو بۆ ئاسایشو بەرگری لەسنوورەکانی باکوورو بەشێك لە باکووری ڕۆژهەلاتی دەولەتی ئیسلامیی، هەروەها موسڵ بە پێتەختی هەرێمی جەزیرە دانراوە٧، کە شوێنی جوگرافیشی دەکەوێتە بەشی ڕۆژئاوای ڕووباری دیجلەوە، بۆیە ناویشی نراوە موسڵ چونکە گەیەنەری نێوان دیجلەو فورات بووە٨. ئەوەی لە بارەی پێکهاتەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیەوە ئاماژەی پێکراوە، ئەوەیە کە نەتەوەی کورد لە دێر زەمانەوە بەشێك بوون لە پێکهاتەی دانیشتوانی ئەوێ، بە تایبەتی کوردەکانی هۆزە دیارەکانی ( الحمدیە، الاریە، الهزبانیە)٩. تەنانەت بۆچوونی وا هەیە دەڵێ: " موسڵ شارێکی کوردی بووە"١٠. سەبارەت بە شارە پێوەندەکانی موسڵیش دەوترێت هەرێمی شارەزوور لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامی تاوەکو سەردەمی خەلیفە هارونە ڕەشیدی عەباسی پێوەندی بە بەڕێوەبەرایەتی موسڵەوە هەبووە١١.

٢. شارەزوور: ـ

سەبارەت بەدەست نیشانکردنی سنووری جوگرافی شارەزوور چەند بۆچوونێکی جودا هەیە، ئەوەی ڕوونتر بێت ئەوەیە کە شارەزوور دەکەوێتە نێوان ( اربل و همدان)١٢، یاخود کورەیەکی فراوانە لە هەرێمی چیاکانو دەکەوێتە نێوان هەمەدانو موسڵەوە١٣. لەم بارەیەوە (ابن المهلهل) دەڵێ:" شارەزوور ناوچەیەکی سەختو دژوارە "١٤، لەبەرئەوە بەشێوەیەکی گشتی دەستنیشانکردنی سنووری شارەزوور* وەك هەرێمێك بەمجۆرەیە: لەباشوورەوە دەکەوێتە نێوان حولوانو خانەقینو کرخ جدان*، لەلای باکوریشیەوە سنووری (اربل) دەست پێدەکات، هاوکات چیای( السلق) کەچیاێ لاهیجانی ئێستایە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتییەوە، هەروەها شارەکانی داقوق* و کورەی باجەرمیٚ* دەکەونە سنووری ڕۆژئاوایەوە١٥.

لەڕووی پێکهاتەی دانیشتوانەوە زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە کۆکن کە شارەزوور هەموویان کوردن١٦، هەندێك بۆچونیش هەیە دەڵێ :"زۆربەیان کوردن "١٧.

ئەم هەرێمە لەڕووی بەڕێوەبردنەوە بەردەوام لە دەستی کوردەکاندا بووەو هیچ والیو کاربەدەستێکی خەلیفەکان نەیان توانیوە فەرمانڕەوایی هەرێمەکە بکەن١٨، بەپێی سەرچاوەکان گرنگترین شارەکانیشی بیتین لە: ( قیسان، تیرانشاه، دزدان، بیر، دیلمستان، نیم ازراە):١٩ .

## دووەم. هەرێمی چیاکان: ـ

شوێنی جوگرافی هەرێمی چیاکان بە درێژایی مێژوو گۆڕەپانی نیشتەجیٚ بوونی کورد بووە٢٠، ئەم هەرێمە لەسەرەتای دەرکەوتنی ئیسلامدا وەك پێکهاتەیەکی جوگرافی دیاری نەکرابوو، بەڵام لەسەردەمی ئیسلامدا بوو بە هەرێمێکی سەربەخۆ٢١و سنوری جوگرافی هەرێمەکەش لە ڕۆژهەڵاتییەوە خوراسانو فارسو ئەسفەهانو لە ڕۆژئاواشیەوە شارەزوورو دەشتی عێراق

دەستی پێدەکرد، باشووری ڕۆژئاوایشی هەرێمی ئازەربایجان بوو٢٢، لە باکووریشیەوە هەرێمی دەیلەم و گەیلان و ڕۆژهەلاتی ئازەربایجان دیاردەکرا، لە باشووریشەوە خوزستان و بەشێك لەعێراق دەستی پێدەکرد٢٣.

سەبارەت بەپێکهاتەی ئیتنی و ڕەگەزی دانیشتوان لەم هەرێمەدا، سەرچاوە ڕەسەنەکان ئاماژە بەوە دەکەن، کە کوردەکان زۆرینەی دانیشتوانی ناوچەکە پێك دەهێنن، بەجۆرێك کە مێژووی نیشتەجێ بوونیشیان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی فەرمانڕەوا کوردەکانی پێش هەزارەی زایینی، کە بریتی بوون لە لۆلۆیی و گۆتی و کاشی و میدیەکان. دیارە کە ئەم نەتەوانە لە چیاکانی زاگرۆس نیشتەجێبوون، کە بنچینەو تۆرەمەی سەرەتای ڕەچەڵەکی کوردن٢٤. هەربۆیە لە سەردەمی ئیسلامیشدا کورد دانیشتوانی گەورەی ناوچەکانیان پێك دەهێنا٢٥. بە جۆرێك ئەو هەرێمانە وەسف دەکران بە وولاتی کوردە دڵڕەقەکان٢٦، کە دەکرێت ئەم وەسفکردنەی کوردان لە تایبەتمەندی بەجەرگی و ئازایەتیانەوە هاتبێت، چونکە لە زۆربەی پەرتووك و سەرچاوەکانی ئەو قۆناغەدا ئاماژەی پێکراوە، سەبارەت بە ناوی شارەکانی هەرێمی چیاش، دەتوانین بڵێین بەشێوەیەکی گشتی پێك هاتبوون لە: ماه البصرە، ماه الکوفە، ماه سبذان، ئوستانی مهر جانقذق، حولوان، ئوستانی شاه قوباد: جگە لەوانەش چەند شارێکی گرنگتریش هەن وەك : کەنگاوەر، گەیلان، سی سەر، هەمەدان، زنجان٢٧ .

## سێ هەم: هەرێمی ئەهواز (خوزستان ) : ـ

ئەم هەرێمە لە سەرەتای ئیسلامدا پێکهاتبوو لە دەڤەرێکی فراوان و تەواوی ئەم شارانەی لە خۆدەگرت : سوق الاهواز، را مهرمز، ایذج، عسکرکم، توستەر، جندی سابور، سوس، سرق، نهرتیری، منازر کە لە بەرامبەری شاری بەسرەدایە ٢٨.

ئەم شارانە وەك هەرێمێك لەكۆتایی دۆڵی نێوان دوو ڕووبارەوەوە دەست پێدەكەن‌و لە دوای ئەهوازیش ڕاستەوخۆ هەرێمی فارس دەهات٢٩.

پێگەی جوگرافی ئەم هەرێمە لە دێر زەمانەوە بنكەیەكی ئابووری ساسانییەكان بووە٣٠،

پێكهاتەی ئەتنیكی‌و ڕەگەزی هەرێمەكەش دانیشتوانی كوردی لەمێژەوە لە خۆگرتووە، كە بەجۆرێك بوونەتە پارێزەری خاكەكەو لەكاتی فتوحاتی عەرەبە موسڵمانەكاندا كوردیش شانبەشانی فارسەكان چەندین جەنگی گەورەیان لەو هەرێمەدا كردووە٣١، تەنانەت شارێكی گرنگی وەك (جندی سابور) كە شارێكی كۆن‌و ئاوەدان‌و سەرسەوز بوو، لەو كاتەدا زۆربەی دانیشتوانی كورد بوون٣٢. ئەم شارە لە سەردەمی فتوحاتدا، دانیشتوانەكەی لە بەردەم لەشكری عەبدوللای كوڕی عامردا جەنگان‌و لەگرتنی شاری (ایزج) جەنگێكی سەختیان كردو ڕووبەڕووی سوپای دەوڵەت بوونەوە٣٣.

## چوارەم: هەرێمی فارس :ـ

وا دادەنرێت ئەم هەرێمە دابەش كرابێ بەسەر هێڵێكدا كە لە: ارجان، النوبندجان، كازرونەوە درێژ دەبێتەوە بۆ سەركەناری دەریای هیند یاخود سنووری (السیف) تاوەكو دەگات بە( الزم) جگە لەمانە هەریەك لە شارەكانی (زم اللوجان، زم جیلویە) یش لەخۆدەگرێت٣٤، ئەم هەرێمەش لەڕووی دانیشتوانەوە كورد پێكهاتەی دانیشتوانی چەند ئوستانێكی پێك دەهێنا، بەتایبەتیش شارەكانی ئەرگان‌و شاپور٣٥، هەروەها شارەكانی پساو داربجرد یش لە هەرێمەكەدا كورد لە خۆدەگرێت٣٦، جگە لەمانەش پێنج مەڵبەندی كوردنشین لەم هەرێمەدا بوونیان هەبوو، بەجۆرێك كە هەر كۆمەڵە كوردێك لەو مەڵبەندانە پایتەخت‌و سەرداری خۆیان هەبوو، ئەو مەڵبەندە كورد نشینانەش بریتی بوون لە : ـ

١. جیلویە: لەنێوان ئەصفەهان و خوراسان .

٢. وەلیجان : لەنێوان شیرازو خەلیجی فارس دایە .
٣. دیوان: کە لەناوچەی سابور( شاپور)دایە .
٤.کاریان: کە لەلای کرماندایە .
٥. شهریار: کە لەلای ئەصفەهاندایەو (بازنجان) یشی پێ دەڵێن، هەروەها باس لە (٣٣)تیرەی کورد دەکرێت لەم هەرێمەدا کە لە سەردەمی فتوحاتی ئیسلامیدا لەو هەرێمەدا بوونیان هەبوو٣٧.

## پێنجەم : هەرێمەکانی ئازەر بایجان‌و ئەرمینیاو ئاران .

سنووری جوگرافی هەریەك لەم ناوچانە لە سەردەمی دوای فتوحات‌و لە کاتی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفاندا کرا بە یەك ویلایەت‌و یەك والیشی بۆ دانرا بۆ بەڕێوەبردنی٣٨. لەم بارەیەوە (المقدیسی) پێی وایە : هەریەك لە ئازەربایجان‌و ئاران‌و ئەرمینیا یەك هەرێمی گەورەن‌و بە هەرێمی ( الرحاب) ناو دەبرێت ٣٩. بەڵام هەندێك مێژوو نووس‌و جوگرافیناسی تر پێیان وایە هەرێمی ئازەربایجان‌و ئەرمینیەو ئاران لە یەکتری جیان٤٠، هەندێك سەرچاوەش هەریەك لەو هەرێمانە سەربەخۆ باس دەکەن‌و پێیان وایە ئازەربایجان هەرێمێکی فراوانە لە نێوان قهستان‌و ئاران‌و ئەرمینیاداو سنووری هەرێمەکەش لە ڕۆژهەڵاتیەوە دەیلەم‌و گەیلانە لەگەڵ دەریای (الخزر)، لە باشووریشەوە عێراقی عەرەبی‌و خۆرئاوای چیاکان‌و هەرێمی جەزیرە دەست پێدەکات‌و لە ڕۆژئاواشیەوە هەرێمی ئەرمینیاو وولاتی (الکرج)ە.
سەبارەت بە بەشی باکووریش وولاتی ئاران‌و چیای (القبق)و قەوقاز دیاری دەکرێت٤١.

بەنیسبەت هەرێمی ئارانیشەوە سنوورە جوگرافییەکەی لە باکوورەوە ڕۆژئاوای ڕووباری (الرس)ە و سنوورەکانیشی لە ڕۆژهەڵاتەوە دەریای قەزوینە، هەروەها لە باشووریشەوە هەرێمی ئازەربایجان دێت، لە باکووریش

زنجیره چیاکانی قەوقاز دیاریدەکرێنو خۆرئاوای هەرێمەکەش ئەرمینیاو بەشێکە لە وولآتی (کرج)٤٢.

گرنگترین شارەکانی ئازەربایجانیش بریتین لە ئەردەبیل، مراغە، تبریز، ارمیە، هراشنە، خویّ، سلماس، میانە، باجروان ٤٣.

سەبارەت بەپێکهاتەی رەگەزی دانیشتوانی ئەم هەرێمەش ئەوا کوردەکان لە مێژەوە لەم هەرێمەدا بونیان هەبووە٤٤. بەتایبەتی لە ناوچە شاخاویەکانی سنووری تورکیاو عیراقو ئێرانی ئێستادا، هەروەها لە بەشەکانی ئەرمینیاو ئارانیش کورد هەبوون، لە گرنگترین شارەکانی ئەرمینیاو ئارانیش: گەنجە، بزعە، بەردەدار، شەمکور، نقچوان، بلیقان، مەرەند، شاسران، دوین، شماخ، دەربەند (باب الابواب)، شیروان، هەریمی خێلآت ٤٥.

## باسی دووەم:

# دەوڵەتی ئومەوی و تێڕوانینیان بۆ ژیانی سیاسی و کۆمەلایەتیو ئابووری هەرێمە کوردییەکان

### یەکەم: دیسپۆتیزمی ئومەویەکان لە بەرامبەر کورد دا

سیاسەتی ستەمکارانەی زۆربەی فەرمانڕەواو والی ئومەویەکان* هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ بەرهەڵستکاریو لکاندنی ناعەرەبەکان بەڕیزەکانی بزووتنەوەی خەواریجەوە، چونکە والییەکانی ئومەویو ناکۆکییان لەگەڵ خەواریجەکان بواری نزیکبوونەوەی خەواریجو موسوڵمانە ناعەرەبەکانی زیاتر فەراهەم هێنابوو، بەتایبەتی لە ناوچەکانی ڕۆژهەلاتی دەوڵەتی خەلافەتدا٤٦، کە زۆرینەی کوردنشینەکانیش لەو هەرێمانەدا بوون.

لێرەوە دەکرێت ستەمی ئومەویەکانو دەسەلاتدارێتی ئۆتۆکراتیانەی ئەوان، بووبێت بە هۆکارێکی سەرەکی پەیوەندیەکانی کوردو بزووتەوەی خەواریج، چونکە کوردەکان بێزار بوون لە والیو کار بەدەستانی ئومەوی، ئەوان دنیاگەراییو دەسەلات هەموو ئەرکانو ئەرکێکی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیی لەیاد بردبوونەوە. هەربۆیە لەم بارەیەوە شوکر موستەفای نوسەری کورد دەڵێ "ئەمن لەسەر ئەوە سورم لەبەرئەوەی کورد لە هەموو گەلانی تر زیاد ناڕازی بووە، ئیتر لە هەر لایەك شنەیەك ناڕەزاییو بانگی ئازادی هەڵی

کردبێت پێی گەشاوەتەوەو بووە بە کەوا سوری پێش لەشکری‌و پێشەنگایەتی کردووە" ٤٧.

دیارە ئەمەش ئاکامی تورەیی‌و ستەمیی بنەماڵەی ئومەوی‌و سیاسەتی نەژادییان بوو لە مەڕ ژێر دەستەکانیان، ئەوان بەردەوام دەمارگیریی عەرەبایەتییان فەراموش نەکردبوو، هەربۆیە ئەم دەمارگیریە ببوویە فشاری دەزگاکانی دەوڵەت لەسەر گەلان‌و دواجار مایەی دڵتەنگی‌و نارەزایی گەلانی لێهاتە بەرهەم. ئەم فشارە بەتایبەتی لە سەر گەلانی ناعەرەب بەجۆرێك رەنگی دابوویەوە کە لە تەواوی مافەکان‌و کارە دیارو مەدەنی‌و کۆمەلآیەتییەکان بێ بەشکرا بوون٤٨. لەلایەکی تریشەوە خوێن رشتن‌و بێدادی گەلان هۆکارێکی تری یاخی بوونیان بوو٤٩.

لەم نێوەندەدا شانبەشانی خەواریجەکان گەلی کوردیش هەر لەسەرەتای پەیوەندیەکانیەوە لەگەڵ جووڵانەوەی خەواریج کاردانەوەی توندوتیژی ئومەویەکان بەجۆری پەیوەندیەکانیەوە دیار بوو. لەم بارەیەوە دکتۆر شوان عوسمان لە کتێبی پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کوردستان دا هێناویەتی‌و دەڵێ :" رەنگە هۆکارێك بۆ ئەوەی شارەزوور ببێتە بنکەیەکی سەرەکی خەواریج و مل بۆخەلافەت نەدات، بگەرێتەوە بۆ شێوازی میکانیزمی گرتنی ناوچەکە کە بەشێوازێکی خوێناوی تراژیدیای لە دڵی خەڵکی ناوچەکە درووست کردبوو" ٥٠.. بەمجۆرە دەتوانین بڵێین جەنگەکانی فتوحات لە نێوچە کوردیەکانداو رشتنی خوێن لە هەندێك لەو شارە کوردیانەی کە بە ئاشتی موسڵمان نەبوون، دەکرێت هۆکارێکی ئەو بێزاریە بێت کە دواتر کوردەکان دژی کار بەدەستەکانی خەلافەت دەریان دەبری، بەتایبەتی دژی ئەو کاربەدەستانەی کە هەڵس‌و کەوتیان توندوتیژ بوو، چونکە ئاکاری هەندێ لە والییەکان هۆکارێکی تری بێدادی نەتەوەکان بوو، بەتایبەتی راپەرینی شوێنێکی وەك هەرێمی جەزیرە شانبەشانی خەواریجەکان، کە کورد هێزێکی دیاری دانیشتوانەکەی بوو، دەگەرێتەوە بۆ ستەم‌و زۆری مەوالییەکان و دوورکەوتنەوەیان لەو بنەمایانەی ئیسلام کە خۆیان بانگەشەیان بۆ دەکرد٥١.

ئاشکرایە لە شوێنێکی وەك جەزیرەدا کوردەکانو پەیوەندییان لەگەڵ خەواریجو جوولانەوەکانیان نەخشێکی سەرەکی ڕووداوەکان بوو، نەتەوەکان بەزیاتر تێکەڵ بوونیان لە تەك زانیاریەکانی ئیسلامو شەرعدا هەستی بەرلوردکاریان لەنێوان ئەو زانیاریانەو ئاکاری ڕۆژانەی کار بەدەستان لەلا دروستببوو، هەر بۆیە بەدوورکەوتنەوەی والییەکان لە بنەماکانی ئیسلام ڕادەی بێزاری نەتەوە ژێردەستەکان زیادی دەکرد، چونکە والییەکانی سەر بە بنەماڵەی ئومەوی وەك بنەماڵەیەکی ئەرستۆقرات مامەڵەیان لە تەك ناعەرەبەکاندا دەکردو گەلانیان لە خزمەت کەیفو ڕەفاهیەتی خۆیان دەچەوساندەوە.

## دووەم: تێڕوانینی کۆمەڵایەتی فەرمانڕەوایانی ئومەوی بەرامبەر بەکورد

هەستی دەمارگیریو خۆبەزلزانینی ئومەویەکانو سیاسەتی نەژادییان لە بەرامبەر گەلانی موسڵمانی نا عەرەبدا هۆکارێکی تری بەرهەڵستکاریەکان بوو. دیارە عەرەب لەپێش ئیسلامدا دابەشببوون بەسەر چەند هۆزێکداو تا سەردەمی ئیسلام هیچ کاتێك وەك میللەتێکی تەواو دەرنەکەوتبوون. دەمارگیری هۆزایەتی لەلای عەرەب لەپێش ئیسلامدا بریتی بوو لە ڕۆحی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوان، دەمارگیری نیشانەی پیاوەتیو شەرەفو تەواوی شانازیە کۆمەڵایەتیەکان بوو. لەو چاخەی عەرەبدا دەمارگیریەکی پیاو سالارانە ژنو چینە عەبیدەکانی تری کۆمەڵگای لە بۆتەی پێناسەی پیاوەتیدا سڕیبوویەوە. پاش ئەوەی ئەم هێزە مرۆییەی عەرەب لەژێر پەیامێکی نویو گوتارێکی گشتی ئینسانیدا ڕێکخراو بەسەر هەردوو ئیمپراتۆریەتی فارسو ڕۆمدا زاڵ بوو، ئیتر میللەتانی نا عەرەب هێزیان لە دەستداو ئەوانی جاهیلی پێش ئیسلامو زاناو هۆشیاری دوای ئیسلام بوونە میراتگری سەر زەمینی فارسو عەجەم، لێرەوە هەر دزە کردنێکی پێش ئیسلامو زیندوو بوونەوەیەکی

سەردەمی جاهیلی لە ئاکاری کۆمەلآیەتی عەرەبەکاندا نەخشی جوولآنەوەکانی ڕاستەوخۆ دیاری دەکرد٥٢. ئەوە بوو ئەو دزەکردنەی نەریتە نەرێنیەکانی عەرەب بۆ سەردەمی ڕاشدینەکان دیسانەوە لە سەردەمی ئومەویەکاندا بە ئاشکرا بانگەشەی بۆ دەکرا، ئیتر هەستی دەمارگیریو خۆ بەجیاواز دانان لە زیهنی عەرەبدا زیندوو دەبویەوە، ئەوان سەرکەوتنە یەك لەدووایەکەکانو کەوتنی ئیمپراتۆرە نەخۆشەکانی فارسو ڕۆمو داهاتی بەپیتو فراوانی ناعەرەبەکان لە خۆبایی کردن، ئیتر نەوەی موجاهیدەکانی سەردەمی فەتح لە ژیانێکی ئەرستۆکراتیانەدا پێگەیشتبوون، ئەم نەوەیە نەوەی جەنگو شیرو کەوان نەبوون، بەئاسانی چنگیان لە خۆشیەکانی ژیاندا گیربیوو، دەبوو جیاواز بنو ئیتر هەموو ئەو خەڵکانەیتر ڕامکراوو ژێر چەپۆکی ئەوان بن، ئەم تایبەتمەندیە سیمای مامەڵەی کۆمەلآیەتی ئەو سەردەمە بوو، هەر بۆیە بنەماڵەی ئومەویەکانو لایەنگرانیان پشت بەستوو بە هێزەکانی عەرەبو قورەیش لەسەر بنەمای ڕق لێبوونو سیاسەتی نەژادی ژیانی کۆمەلآیەتیی دەوڵەتیان ئاڕاستە کرد. لوتکەی ئەم ئاڕاستەیەش لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا (٦٥-٨٦ك/ ٦٨٧-٧,٩ز) و لە سەر دەستی کارگێڕەکەی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفیدا بوو٥٣. دیارە ئەم هەستەش بوو بەهۆکارێك بۆ دەرچوونی گەلانی نا عەرەب لە خەلافەتی ئومەویو پەیوەندی کردنیان بە هەر هێزێکەوە کە دژی ئومەویەکان بێت، هەروەك لە جوولآنەوەی (ابی مریم)و سەرەتای فەرمانڕەوایی موعاویەدا هەموو ئەوانەی لە ڕووی ئیتنیو ّمەزهەبەوە جیاواز بوون فیدراسۆنێکیان پێك هێنا٥٤، کە درووشمی یەکسانیخوازی خەواریجەکان کۆیکردبوونەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی خەلافەتی ئومەوییەکان، چونکە بۆ هەمووان ڕوونبووەوە ئەوان لە سەر بنەمای بالآدەستی عەرەبو بنەماڵەکەیان دامەزرابوون، ئیدی بە خۆ پەسەندییان منداڵ و نەوەی موسڵمانانیان بۆخزمەتی خۆیان بەکاردەهێناو هەموو جۆرە ستەمێك بەناوی عەرەب نەبوونیانەوە لێیان دەکرا.

بەمجۆرە ناعەرەبەکان بەنزمیی ئاستی مرۆڤ بوون تەماشا دەکران، هەر بۆیە گەلانی موسوڵمانی ناعەرەب لە سایەی هێزی نەژادی ئومەویدا قەد نەیان دەتوانی بەهیچ کاروبارێکی دەوڵەتیو کۆمەڵایەتی تایبەت بە خۆیان هەستن، تەنانەت ئەوان مافیان نەبوو ژنو ژنخوازی لەگەڵ عەرەباندا بکەن، بە هێنانی کچی عەرەبێکی بیابان نشین لەلایەن موسڵمانێکی ناعەرەبەوە زیندانی و قۆڵبەستکردن دەبووە چارەنوسیان. هاوکات حکومەتو دادگا لە دەستی عەرەب بوو، ئەوان هیچ جۆرە پلەو پایەیەکیان نەبوو، تەنانەت مافی هەڵسوکەوتی تایبەتیو ژیانی رۆژانەی ئاساییان نەبوو، بۆنمونە وەك سواربوونی ئەسپو درووست کردنی چەكو کاری سەربەرزانە ٥٥.

دیارە لە سەرەتاوە دەوڵەتی خەلافەت خاڵی بوو لەم سیاسەتەو هەموو جۆرە دەمارگیرییەکی عەرەبی، بەلأم ئەم قۆناغە لە سەردەمی موعاویەوە بەخێرایی دەستی پێکردەوە، لێرەوە دەمارگیری بووە مۆرکی سەرەکی خەلافەتو لە رێبازی بەندایەتیو پەرستشو بۆ خوا ژیان جیاواز لە نەریتی خەلیفە راشیدینەکان دوور کەوتنەوە٥٦.

لە بەرئەوە ئاساییە مەوالییەکان ببنە بەشێك لە ئارەزووی ئومەویەکان بۆ سەپاندنی دەمارگیریەکەیان بە سەریاندا، ئەوەبوو مەوالییەکان لە سەرەتاوە داماڵران لە هەموو جۆرە فەرمانرەواییەكو بە هاوڵاتی پلە خوارتر لە خۆیان سەیریان دەکردن کەشیاوی هیچ پۆستێکی ئیداری نەبوون، تەنانەت ئەگەر کەسێك تەنها لەدایکەوە عەرەب نەبووایە بە( هجین) ناودەبراو تێروانینێکی نزمو سوکیان بۆی هەبوو، بە جۆرێك نەدەکەوتنە شوێنی جەنازەی مردوویانو ئەبەد لە پشتی سەریانەوە نوێژ نەدەکرا٥٧. هەموو جۆرە ژنو ژنخوازیەکیش لەگەڵیان دەدرایە دواوەو قەدەغەی بیری خۆشەویستیو زەواج کرابوو لەتەکیان. ئەمجۆرە تێروانینە لەسەردەمی حەجاجدا ساڵی( ٧٧ك- ٦٩٦ز) گەیشتە لوتکەو ئیتر هەموو بەخشینو بەخششێکی نێو سوپا بۆ ئەوان قەدەغە بوو٥٨، هەرچەندە مەوالییەکان بە شێوەیەکی فراوان لە دیوانەکاندا بە کاردەهێنرانو بوارێکی زانستی فراوانیشیان هەبوو، بە جۆرێك مێژوو

نووسی گەورەی ئیسلام ئیبن خەلدوون دەڵێ: "هەڵسووڕاوانی بواری زانستی زۆربەیان عەجەم بوون" ٥٩. بۆ نمونە زانایانی ئسووڵی فیقهی هەموویان لە عەجەمەکان بوون، هەروەها زانایانی کەلامو موفەسیرەکانی قورئان لە موسڵمانی نا عەرەب بوون٦٠، بەلام بە هیچ جۆرێك سەرکردایەتییان نەدەدرایە دەست٦١، ئەمەش بەشێك بوو لەو تێڕوانینە کۆمەلایەتییەی کە ئەوانیان بەکەم سەیردەکردو جێگای متمانەی ئەوە نەبوون کە شوێنە هەستیارەکانی دەوڵەتیان لە ئەستۆدا بێت، هەربۆیە ناڕەزایی بەهێز لەدەزگاکانی دەوڵەتەوە سەریهەڵدا، ئیتر هێزی بەرهەڵستکاری نا عەرەب دەنگی بێزارییان هەڵبڕی و ڕێگەی توڵەیان گرتەبەر٦٢، لێرەشەوە دەتوانین هاریکاری نێوان مەوالیو خەواریجەکان،یان هاریکاری کوردو خەواریج لە پێناوی خواستی یەکسانیو کۆمەلایەتیو بەشداری لە بەڕێوەبەرایەتیدا بە کارێکی چاوەڕوان کراو دابنێین٦٣

## سێ هەم: سیاسەتی بەعەرەبکردنی زمانی نووسینو دیوانەکان

یەکێکی تر لەهۆکارەنی پەیوەندی کوردو خەواریج پاڵنەری بەعەرەبکردن بوو لە سیاسەتی دەوڵەتدا، بەشێوەیەك کاریگەرییەکی زۆری کردە سەرلایەنی دەروونی مرۆڤی کورد، ئەوەبوو لەلایەن دەوڵەتەوە ڕاستەوخۆو نا ڕاستەوخۆ هەوڵی سڕینەوەی سیماو ڕوخساری زمانو کەلتوری کوردی دەدرا، لەو پرۆسەیەدا پوکانەوەی ڕەگەزو بنەما بەدیهاتووەکانی چەمکی نەتەوەی کورد بەشێك بوو لە سیاسەتی ئومەویەکان٦٤. ئەم شێوازەش لە سەردەمی هەریەك لە عەبدولمەلیکی کوڕی مەروانو حەجاجی بەردەستو پیاویدا پەرەی سەند. سەرەتای هەوڵەکانیشیان لە دیوانەکانەوە دەستی پێکرد، ئەو دیوانانەی ڕۆژهەلاتی خەلافەت تا ئەوکاتیش ڕوویەکی ئێرانییان پێوەدیار بوو، کوردان بە حوکمی هاوخوێنیو نێزیکی فەرهەنگو کەڵچەری ڕابردوویانەوە لە

ناو ئێراندا، لەلایان قورس بوو فەرهەنگی عەرەبی کۆتایی بەڕابردوویان بهێنێت، لەو سەردەمەدا حەجاج فەرمانی دەرکرد بۆ بە عەرەبکردنی هەموو دیوانەکانی کاروباری ولآت، لێرەوە کاریگەریەکی ڕەش لە ناو دەروون و ڕۆحی مەوالی یەکاندا بە جێماو هەموو ڕوویەکی عەجەمی بە پلانەکان و نەخشە عەرەبیەکەی حەجاج دەستی بە سڕڕانەوە کرد٦٥

ئەم سیاسەتەی دەوڵەت ناساندنی زمانی عەرەبی بوو وەك زاری ڕەسمی دەوڵەت، هەربۆیە چینێکی فێرخوازیان درووست کرد بۆ فێربوونی مندالآن. بەمجۆرە سیاسەتی بنەماڵەی ئومەویەکان و بەعەرەبکردن لە سەر حسابی یەکێتی ئیسلامیی، بوو بەهۆی دروست بوونی ڕەوتی سیاسی و ئاینی بەرهەڵستکارو بۆچوونی جیاواز لەو یەکێتیەداو لەناو گەلانی موسوڵمانی نا عەرەبدا٦٦ لەم سیاسەتەدا کوردانیش پێوە بوون، ئیتر ئەو ڕێنووسەی کە پێشتر کورد پێی دەنووسی گۆڕانی* بەسەردا هات٦٧. بۆنمونە ئایەتوللآ مەردۆخی دەڵێ "لەسەدەی شەشەمی (پ.ز) دا جۆرە پیتێك داهات پێی دەوترا پیتی (ئوستانی)، ئەم پیتانە تا هاتنی ئیسلام لە ناو کورد دا بەکاردەهاتن لە نووسیندا، بەلآم کە ئیسلام هات ئەم جۆری نوسینە گۆڕدرا بۆ پیتی کوفی٦٨. هەرچەند ئەم هەنگاوە لەلایەن دەوڵەتەوە وەك هەنگاوێکی خزمەت و پێشکەوتن سەیر دەکرا، بەلآم خەڵکی لە سەر ڕێبازی خۆیان و نووسینی خۆیان مانەوە"، تا وەکو لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا فشاری ئەم سیاسەتە لە سەریان کۆتاییان هێنا بە داهێنانەکانی نوسینی ڕابردوویان، ئەمجۆرە سیاسەتەش تەنها کاردانەوەی لەلایەن کوردانەوە هێنایە گۆڕی٦٩. چونکە ئاسایی بوو کوردیش وەك بەشێك لە مەوالییەکان و وەك بەشێك لەو زمانانەی کە هەوڵی سڕانەوەیان دەدرا ئامانجی خۆشیان لە پاراستنی زمانەکەیان لە دژایەتی دەوڵەتی ئومەوی و پشتگیری بزووتنەوەی خەواریجدا بدۆزنەوە.

## چوارەم: ئومەویەکانو ژیانی ئابووری هەرێمە کوردیەکان

هۆکـارێکی تـری پەیوەنـدی کـوردو خـەواریج نالـەباری سیاسـەتی ئـابووری ئومەویـەکان بـوو، هـەر لـە سـەرەتاوە ئەرسـتۆکراتیەتی قـورەیش بـەهۆی دەوڵەمەندبوونیانو دەسکەوتی بازرگانی هەمەچەشنەوە لە زەویەکانی خـاکی ئیسلامیدا باری ئابوورییان گەشەی سەند٧٠، لە بەرامبەریشدا باجو خـەراج و سەرانە* سەپێنرابوون بەسەر گەلە ستەم لێکراوەکـانو بـارێکی گـران لەسـەر بـژێوی ژیانیـان دروسـت ببـوو٧١، ئەمـەش بـوو بـە هۆکـارێکی سـەرەکی لـە هەستانی ناوچە کوردیەکان دژی ئەو نەزمە ئابوورییە، بـەجۆرێك سەرچـاوەکان دەڵێن پشتگیری کورد بۆ زۆرێك لـە هـۆزە راپـەڕیوە عەرەبیـەکانی موسـڵو دانیشتوانی هەرێمی جەزیرە لەبەر وەرگرتنی مەزهەبی خەواریج نەبوو، چونکە ئەو هۆزانە زۆرینەیان خەواریج بوون، بەڵکو لەبەر توندی سیاسـەتی دەوڵـەت بوو لە داواکردنی خەراج و باجەکانی تردا٧٢، لەبەرئەوە سەرچاوەکان دەڵێن خـەبات لـەدژی دەرەبەگایـەتی لـە ئاسـیای ناوەڕاسـتو ڕۆژهـەڵاتی دەوڵـەتی ئومەویـدا، بەنـدبوو بـە تێکۆشـان بـۆ سەربەسـتیو ڕزگـاربوون لـە حـوکمی عەرەبـەکان، هـەر ئەمـەش نـاوەڕۆکی بزووتنـەوەکان بـوون٧٣. لەبەرئـەوە شـێوازی چەوسـاندنەوەی دەرەبەگایـەتیش ببوویـە هۆکـاری نـاڕەزایی مەوالییەکان٧٤. ئەم سیاسەتە لە ئابووری دەوڵەتدا لـە سـەردەمی حـەجاجی کوڕی یوسفدا زیاتر بوو، چونکە ئەو ڕووپێوی زەوییەکانی بەشـێوازێکی نـوێ داڕشتەوەو تۆماریکردن، بەشێوەیەك خاوەن زەویـەکان نـەیان دەتـوانی یـاری بەپێوانەی زەوییەکان بکەن، یـاخۆ یـاری بەڕێـژەی خـەراجو دەیـەکی دیـاری کراو بکەن، چونکە پێشتر زەوییـەکان تۆمـارکرا بـوون بـەپێی تۆمـاری کـۆنی ساسـانییەکان، بـەم جـۆرە حـەجاج ئـەم سیـستەمەی گـۆڕیو ئیـدی هـیچ پێویستیەك بە کارمەندانی مەوالی نەما، هەموو بوونێکی ئابووری خۆشیان لـەو پرۆژەی حەجاجدا بەتەواوی لـە دەسـت دا٧٥. بۆیـە زۆربـەی بزووتنـەوەکانی خەواریجو کۆبوونەوەی نەتەوە جیاوازەکان لەدەورییان لـە سـەرو بەنـدی ئـەم

گۆڕانکاریانەی دەوڵەتدا بوو، چونکە ئاکامەکەی بە بەرژەوەندی چینی هەژاری خەڵك‌و میللەتدا نەدەشکایەوە، هەربۆیە لەم بارودۆخەدا ڕووکردنە خەواریج سەرهەڵدەدات، چونکە ئەوان لە هەموو جۆرە جزیەو خەراج‌و سەرانەیەك‌و لە هەموو ئەو کۆت‌و بەندانەی باری ژیانیان ڕزگاریان دەکردن.

خەواریجەکان پێیان وابوو زەوییەکان موڵکی هاوبەشی موسڵمانانە٧٦. ئاشکرایە بیرۆکەیەکی لەو جۆرە هەڵگری بیری ( مەزدەکیەت) بوو، مەزدەکیەتیش لە ڕەوشێکی ئابووری گرانی وەك سەردەمی ئومەویەکاندا لەدایك بوو، مەزدەکیەت لە پێش ئیسلامداو لە ئێراندا پێویستیەك بوو بۆ واقیعی ئابوری‌و کۆمەڵایەتی‌و مۆڕاڵی گەندەڵی فارسەکان، بەڵام بزاڤێکی پەرگیرو تێکدەر بوو، لە بنەماکانیدا ڕەچاوی گەلێك پێشهاتی ترسناك نەکرابوو، هەروەك چۆن خەواریجەکانیش گیرۆدەی هەمان ئاکام بوونەوەو وەك مەزدەکیەت شکستیان هێنا لە پرۆژە دادوەریەکەیاندا. دیارە ئەو بیرەی مەزدەك ڕوویەکی کوردانەی وەرگرتبوو لەناو جوتیارو پیشە گەرەکانیاندا کە لێوان لێو بوون لە دروشمی هاوبەشی ئابوری‌و لیبرالی، لەبەر ئەوە وەکیەك بوونی دروشمە ئابووریەکانی مەزدەك‌و خەواریج بوو کە کوردان دایانە پاڵ خەواریجەکانی هاو دەردیان٧٧. بۆ نموونە هەر لەسەرەتاوە کوردەکان پەیوەندییان کرد بە بزووتنەوەکەی خەریتی کوری ڕاشیدی خەواریجەوە لە ئەهواز دا، تەنها بۆ ئەوەی لە خەراج پاك ببنەوە٧٨. هەرچەند دەوترێت لەم بزووتنەوەیەدا کۆبوونەوەی زۆرێك لە ( کوردو مەسیحی و تاڵانچی‌و عەرەب) بۆ بەدەستهێنانی تاڵانی بوو٧٩، کەئەمەش خۆی لە خۆیدا هەمان هۆکاری ئابووری زەقتردەکاتەوە، دەکرێت بپرسین بۆچی کورد لەخەمی تاڵانکردن‌و تاڵانچیەتیدا بووە، ئەوە چی ڕەوشێکی تاریك بووە وای لە کورد کردووە پەنا بباتە بەر تاڵانی ؟ ڕاستە ئەم دەستەواژەیە لەلایەن ئیبن‌ولکەسیرەوە بەکارهاتووە، بەڵام بۆچی لەو کاتەدا ئەو تایبەتمەنیە لەکورد دا زاڵبوو، دیارە وەڵامی ئەم پرسیارە لە سیاسەتی ئابووری ئومەویەکان‌و نەخشی خراپی کاربەدەستانی دەوڵەتدایە لە ئیدارەی خەڵکدا، لەبەرئەوە پێمان وایە ئەو

کۆبوونەوانە فاکتەرێکی داسەپاوی ئابوری قورس لەپشتیانەوە بووە، هەربۆیە وەکو کاردانەوەیەك هەستاون دژی بەردەوامی هەیمەنەی دەوڵەت، هەربۆیە هەموو ڕێگایەکی تێکدەرانەش گیراوەتەبەر، ئەمەش سروشتی هەموو نارەزاییەکی کۆمەڵایەتیو ئابووری خەڵکە، بۆیە دەبینین لە قۆناغەکانی دواتریشدا سەپاندنی باج و خەراج بەسەر ناعەرەبەکاندا درێژەی هەبوو. بۆ نموونە حەجاج لە هەرێمی فارسو ئەهوازدا (١٨) ملێون کە دواتر بوو بە (٢٢) ملێون درهەمی لە دانیشتوان کۆدەکردەوە٨٠، هەربۆیە بەزۆر سەپاندنی باج و خەراج لەو سیستەمە ئابووریەدا بەو جۆرەی کە حەجاج پەیرەوی دەکرد، ئاسایی بوو ڕەگەزی ئابووری بکاتە ڕەگەزێکی سەرەکی لە سەرهەڵدانی شۆڕشو ڕاپەڕینەکاندا٨١، ئەگەر تا لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا لە ساڵانی (٩٩-١٠١ك/٧١٧-٧١٩ز) ئەم شێوازە لە ڕووبەڕووبوونەوەی دەوڵەت دا نامێنێ. دەبینین لەو کاتەدا شۆڕشو ڕاپەڕینو پشتگیری خەواریج کەم دەبێتەوە. چونکە عومەر داوایکرد چیتر مەوالییەکان زەبوون نەکەن، ئەوەبوو نووسی بۆ ( عدی بن ارطا)ی کارگێڕی خۆی، تا سیاسەتی ناماقوڵانەی حەجاج لەسەر هەرێمەکانی ڕۆژهەلات هەڵبگیرێت، هەروەها ڕایگەیاند هەموو بەخششێك کە لە نەورۆزو ئاهەنگەکاندا لەمەوالییەکان دەسەنرا وەری نەگرنو پێویستیشە قەرزی قەرزدارەکانیش بدەنەوە٨٢، هەربۆیە بزووتنەوەکانی کوردو خەوارجیش لە ماوەی ئەو دووساڵەدا بەرەو ئارامی چوون، لەلایەکی ترەوە ڕوویەکی تری هۆکارەکانی پەیوەندی کوردو خەواریج دەگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی خەواریجەکان لە نەزمی ئابووریدا. بۆ نموونە زوحاکی کوڕی قەیسی شەیبانی سەرکردەی خەواریجەکانی هەرێمی جەزیرە بۆ هەرکەسێك لە ڕیزەکانی خەواریج نزیکەی (١٢٠) درهەمی مانگانە بڕیبوو یەوە، بەمەرجێ ئەو کەسە سوارە بوایە، بەڵام ئەگەر پیادە بووایە ( ١٠٠) درهەمی پێدەدرا٨٣. ئەم داهاتەش بەس بوو بۆ کەسێك بیویستایە ژیانی دابین بکات٨٤.

دیارە کە شۆڕشەکەش لە هەرێمێکی کورد نشیندا بووە.

# باسی سێهەم:

# خواستی بیروباوەڕەکانی خەواریج لەلای کورد

## یەکەم: بیروباوەڕی کۆچ لە ژێر سایەی دەسەلاتی ستەمکار:ـ

خەواریجەکان لەگەڵ سەرهەڵدانیان یەکێك لە بیروباوەڕەکانیان داکۆکی کردن بوو لەوەی ئەو دەوڵەتەی کە لە سایەیدان شوێنێکی ئەمان‌و ئاسایش نیەو شوێنی شەڕو تاوانە، واتە دەبێت موسڵمان لە ( دار الاسلام ) دا بژی، هەربۆیە پێیان وابوو شوێنی یەکتاپەرستی لە دەوڵەتدا بەبێ سێبەری دەستەلاتی ستەمکار دروست دەبێت‌و پێویستە لێی یاخی بن٨٥.

لێرەوە یەکەم ئاراستەی کۆچەکەیان بوو بە هۆی دەسپێکی تێکەڵبوون لەتەك ناوچەو دانیشتوانی هەرێمە کوردیەکاندا؛ چونکە ئەوان گروپێك بوون کە بیری کۆچکردنیان لە بنەماکانیاندا داڕشت‌و خۆیان بە بەرەی باوەڕ دەزانی، لە ڕوانینێکی لەم جۆرەشدا هەرچی بەرەی دەسەلات یشیانە بە بەرەی کوفر ناسێنرا٨٦. هەربۆیە لەو کاتەوەی کە خەواریجەکان ڕیزەکانی عەلی کوڕی ئەبو تالیبیان بەجێ هێشت‌و لە ماڵی سەرکردەکەیان عەبدوڵلای کوڕی وەهب کۆبوونەوە، ئیتر سەرکردەکەیان فەرمانی پێکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، پاشان پێی ووتن ئەو فەرمانە ببەنە دەرەوەی ئەو شوێنەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن، دوواتر وتی پەیامەکەمان بگەیەنن بۆ هەندێ لە کورەی چیاکان یان بۆ هەندێ لەو شارانەی دوورە پەرێزی ئەو

بیدعەو ستەمکاریەن٨٧. هەربۆیە لەبەرئەوەی وولآتی کورد یەکەم پەناگەی ئارام بوو بۆ ئەوانەی هانایان بۆ دەبرد، یەکەمین خواستی خەواریجە کۆچکردووەکانی گرتەخۆو بوو بەمەئوایان٨٨. ئیتر هەر کاتێك دووچاری ڕاوەدوونان و بەرتەسکی دەبوونەوە لە ناوچە کوردیەکاندا دەگیرسانەوە، دیارە کوردیش بەردەوام لێقەوماوە خەواریجەکانیان لە خۆگرتووەو ئەم پەنادانەی هەڵهاتووان نەریتی تایبەتکارە نەتەوەییەکەیەتی
هەروەها یارانی ( نافع بن الازرق) دەیانگوت ئێمە هەتا لە بەرەی کوفرا بین ئەوە موشریکین، هەر بۆیە هەتا ئەو بەرەیە بەجێنەهێڵین ناتوانین موسڵمان بین. لەم ڕوانگەیەوە بوو کە بیری کۆچکردن لە ڕیزەکانی نەیاران دەستی پێکرد، لێرەوە فتوایاند ا بە کوچو ئەوانەش کە هەڵنەهاتنایە بە کافریان دەزانین٨٩. زەمینەی ئەم باوەڕەش هەرێمە کوردیەکانی کردە ئامانجی هەڵهاتووان، دیارە کە ئاسایشترین شوێن بۆ ئەوان بریتی بوو لە ناوچە کوردیەکان بۆ ئەوەی ڕووی تێبکەن.

## دووەم: گونجانی بیروباوەڕی خەواریج لەگەڵ کورد

بیروباوەڕی خەواریج لە مەرجەکانی خەلیفە بووندا داکۆکیکردن بوو لەوەی پێویستە خەلیفە تەنها موسڵمان بێتو مەرجی قورەیشی بوونیان بە هەند وەرنەدەگرت٩٠، دیارە باوەڕێکی لەو جۆرەش گەلانی ناعەرەبی ڕاکێشا بۆ ڕیزەکانیان، مێژوو نووسانیش باس لەوە دەکەن کە خەواریجەکان نموونەی دیموکراسیەتی ئیسلامی بوون، ئەمەش هۆکارێکی تێکەڵ بوونیان بوو لەگەڵ موسڵمانانی ناعەرەبدا ٩١، هەربۆیە کوردەکانیش جێگایان کردنەوەو یارمەتیاندان لە بزووتنەوەکانیاندا، لە بەرامبەریشدا خەواریجەکان کوردیان لەڕیزەکانیان وەردەگرتنو یارمەتیشیان دەدان بۆ گەیاندنی ئامانجەکانیانو پێشوازیان لە هەموو کوردێك دەکرد بۆ ڕیزەکانیان٩٢.

بەم جۆرە مەوالییەکان بەخێرایی چوونە ڕیزی خەواریجەکانەوە، چونکە سەرەڕای ستەمی ئومەویەکان کەوتبوونە ژێر کاریگەری بیروڕاکانی خەواریجەکانەوە، ئەویش لەبەر ئەوەی لەلایەك هێزی دیموکراسی لە گوتارەکانیاندا هەبوو لەلایەکی تریشەوە، خەواریجەکان پابەندبوون بەئاینو تەقواو خواپەرستیو چاکەخوازیەوە٩٢، بەمەش مەوالییەکان سەرسام بوون بەبیروباوەڕە ئاینیەکانیانو کەوتنە ژێر کاریگەریانەوە، یاخۆ خەواریجەکان بەچەکی ئاین توانیان کوردان بەکاربهێنن، چونکە پێیان وابوو باشترین چەکێکە بۆ نەمانی جیاوازیە نەتەوەییو ئیتنیەکان، چونکە ئەوان زۆر بەندایەتیان دەکردو ڕۆچوو بوون لە گۆشەگیریو زوهدو گوێنەدان بەماڵی دونیا، بەمجۆرەش تەقوایان دەکردە چەکی ستراتیژی بۆ ڕاکێشانی مەوالییەکان٩٤. بەشێوەیەکی گشتی ئەم هۆکارە وای لە کوردەکان کرد کە بەلای بیری خەواریجدا بچن. بەتایبەتی لە شارەزوورو دەوروبەری موسڵو هەرێمی جەزیرەدا، چونکە ئەو داوا دیموکراسیەی کە خەواریجەکان بانگەشەیان بۆ دەکرد بۆ بەدی هێنانی یەکسانی بوو لە نێوان هەموو گەلو کۆمەڵێکدا، ئەو یەکسانییەی لە سیاسەتی ئەمەویەکاندا ئامادەیی لەقببوو، هەربۆیە سەرنجی کوردەکان* لەگەڵ بانگەشەکانی ئەوان یەکی گرتەوە٩٥، چونکە خەواریجەکان دەیان ووت: " پێویست نیە خەلیفە قورەیشی بێت، یاخۆ عەرەب بێت، بەڵکو بۆی هەیە بەندەیەکیش بێت مادام موسڵمانەو توانای بەڕێوەبردنی هەیە "٩٦. دیارە خەواریجەکان لەسەرەتادا تەنها عەرەب بوون مەرجی خەلیفە بوونیان بوو، بەڵام کە مەوالییەکان هاتنە ڕیزیانەوە بانگەشەکەیان لە عەرەب بوونەوە بۆ خەلیفایەتی گۆڕیو ووتیان تەنها موسڵمان بێت دەکرێ ببێتە خەلیفەی موسڵمانان ٩٧. لەلایەکی ترەوە ئەم بانگەشەی یەکسانیو دادپەروەریە کۆمەڵایەتیەی خەواریجەکان جۆرێك بوو لە پارێزگاری لە بۆچوونە کۆنەکانی ئێرانیەکان، لەبەرئەوە چالاکی بانگەوازکارانی عەرەب بۆ یەکسانی نێوان موسڵمانان وەك هێزێکی سیاسی وابوو بۆ ڕاکێشانی ڕۆحی مەوالییەکانو یەکگرتنەوەی بانگەشەکانی خۆیان لەگەڵ

بۆچوونە کۆنە زەوتکراوەکانی ئەوان٩٨. ڕۆژھەلاَتناسان لەم بارەیەوە دەڵێن خەواریجەکان مادام داوای یەکسانیان دەکرد لە نێوان عەرەبو مەوالییەکاندا، ئەوا چەندین ڕەگەزو نەتەوەی جیاوازیان بەم سیاسەتە ھێناوەتە ڕیزەوە، نمونەش بۆ ئەو بزووتنەوانە دەھێننەوە کە لەجەنگە ناوخۆییەکاندا بەشداربوون لەوانە بزووتنەوەی خەریتی کوڕی ڕاشید کەفارسو کوردو مەسیحی لە دەوری خۆی کۆکردەوەو لە کار بەدەستانی خەلیفەی عەرەب ھەڵگەڕانەوە لە ئەھوازو فارسدا، دیارە بۆچوونی دیموکراسیانەی خەواریج توانیویەتی ھەموو ئەوانە یەك بخات٩٩. ھەر ئەم بیروباوەڕانەش بوون بیری ئایینی خەواریجی لە ناو کوردەکانیشدا بلاَوکردەوە. بۆ نموونە بۆچوون ھەیە پێی وایە دەستەی (الیزیدیە) کە دامەزرێنەرەکەی (یزید بن انیسە)یە١٠٠. لە گوتارەکانیاندا ئەوە ڕووندەکەنەوە کە دەبێت بە یەکچاو تەماشای عەرەبو نەتەوەکانی تری موسڵمان بکرێت و نابێ جیاوازی بکرێت لە نێوانیاندا، ئەم ڕەوتە دەستەیەك بوون لە ( الاباضیة )*ی خەواریج جیابوونەوە، ھەروەك لەپێشەکی ( ماھی یزیدیە ومنھم ومنھم الیزیدون) دا پەنجە بۆ نووسینی ( الغلو والفرق المغالیە) ڕادەکێشێ و دەڵێت:"یەزیدیی مەبەستی لە ھەموو ئەوانەن کە لە دەڤەری کورد نشینی (سنجارن)*، کە ئێستاش وەك بیروباوەڕێکی کۆن لە ناو کورد دا ماون١٠١. ئەم دەستەیە دەڵێن خوا لە غەیری عەرەب پیاوێك بۆ خەڵکی دەنێرێو کتێبێکیشی لە ئاسمانەوە بۆ دەنێرێتە خوارەوەو خەڵکەکە ئیتر وورده وورده واز لە یاسای موحەمەد دەھێنن١٠٢" ھەروەھا دەڵێن "ھیچ خوایەکی تر نیە جگە لە یەك خوداو موحەمەدیش نێردراوی خوایە بۆ عەرەب نەك بۆ ئێمە، ئایینی ئیسلامیش نەسخ کراوەتەوە بە پێغەمبەرێکی عەجەم"١٠٣. بە ووتەی لێکۆڵەرەوەی ئەمریکی ( ئا. جۆزیف) ئێزیدییەکانی کردوون بە پاشماوەی خەواریجەکان لە پەیڕەوانی ( یزید بن انیسە). ھەروەھا (سمیۆنۆف) پێی وایە یەزیدییەکانی میزۆپۆتانیای سەرو لەگەڵ یەزیدییەکانی کانپروت و ( بوازیج)و ئەڤغانستان سەر بە مەزھەبی مەروانینو ئەوان لەلایەن موسڵمانانەوە بە خەواریج دەزانرێن ١٠٤.

لەڕاستیدا یەزیدییەکان سەرەتاکانیان بەدەرە لەخەواریجەکانو وەك ئاینێکی کۆنی کورد مێژوویەکی کۆنتریان هەیە، بەڵام ئەمە تەنها بۆچوونی هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسانە، ئەگەر نا بیری سیاسی خەواریجەکان لە هەرێمی جەزیرەو ئەو جێگایەی کە ئێزیدیە کوردەکانی لێیە زۆر بە بەرینی بڵاوبووەتەوە، چونکە خەواریجەکان لەگەڵ ئەو مەزهەبانەدا بیری ئایینیو سیاسی خۆیان گونجاندووە، کە نەیاری دەوڵەتو بیری مەزهەبی دەوڵەتن، نەك ئەوان خەڵکی ناوچەکە بهێننە سەر باوەڕی خۆیان.

هەرچەندە سەرچاوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە بیروباوەڕی خەواریج لە ناو کورد دا بڵاوبۆتەوە، تەنانەت لەناو کورد دا بۆچوونی وەك خەواریج هەبووەو ئەوانیش هەریەك لە خەلیفە ڕاشیدینەکانی عوسمانو عەلییان داوەتە دواوە١,٥. هەروەها (المسعودی) لە باسی ڕەوتەکانو شوێنەکانی خەواریجدا باسی لە (ازارقه، النجدات الحمریه، الجابیه، الصفریه)، دەکات و دەڵێ:" هەرێمەکانیان لە سنجارو تەلەعفەرو وولاتی (دیار ربیعه) یە لەگەڵ( السن، بوازیج):١,٦. هەرچەندە خەواریج لە ئازەربایجان بەپلەیەکی کەمتر بڵاوبوونەوە، بەڵام لەو هەرێمەدا ناوی دەریاچەی (اورمیه) بە دەریاچەی شورات ناو دەبرێت١,٧، کە یەکێکە لە ناوەکانی خەواریجو ناوچەکەش ناوچەیەکی کوردییە، هەروەها هەندێك لە ناوچە کوردیەکانی دەروبەری موسڵیش بە وولاتی شورات ناوبراوون، تەنانەت لە ناو خەڵکی (داقوق)* کە شارێکی سەر بە هەرێمی جەزیرەیە بیری خەواریج بڵاوبۆتەوە و زۆرێك لەلاوەکانی ئەوێ هاتونەتە ڕیزی ئۆردووی خەواریجەوە١,٨ز

هەروەها (ابن الندیم) ئەو هەرێمانەی کە زۆربەی دانیشتوانیان خەواریج بوون باسیان دەکات لەوانە :( عمان، سجستان، وولاتی ئازەربایجان و دەوروبەری، السن، بوازیج، کرخ جدان) *. هەروەها پێی وایە مەزهەبی خەواریج زۆرترین مەزهەبی ئایینی بوو لەو کاتەدا لە ناو کورد دا بڵاوبوویەوە١,٩. هاوکات لە ( عقد الفرید) دا هاتووە کە ئارەزووی دانیشتوانی هەرێمی جەزیرە بە جۆرێك بووە بۆ بیری خەواریج کە ناوچەکەیان ناوبراوە بە

( الجزيره الخارجيه) ١١٠.. هەروەها (الدويهی) بیری ئایینی خەڵكی جەزیره بەوە باس دەكات كە لە قۆناغێكدا زۆربەی دانیشتوانەكەی خەواریج بوون١١١.
دیاره ئەم بڵاوبوونەوەیە لە هەرێمە جیاوازەكانی كوردستان دا دەرەنجامی گونجانی بۆچوونەكانیان بوو لەگەڵ كورد دا، لەلایەكی ترەوە دەرەنجامی خەباتی خەواریج بوو دژی ئەو ڕژێمە ئەرستۆكرا تییەی كە هەموو تەما گرتنو نیازێكی پەره پێدانی سیستەمی دەرەبەگایەتی بوو، هەروەها دەرەنجامی ئەو گوتاره بوو كە ڕێگای نەدەدا بێجگە ڕەگەزی قورەیشی، نەتەوەو ڕەگەزێكی تر كاری موسڵمانان لە خۆ بگرێت. چونكە درووشمی بەرزكراوەی خەواریج دەیگوت ئەوانەی بە ڕەنگی پێستو نەژاد جیاوازنو موسڵمانن بە یەك چاو تەماشا بكرێنو جیاوازی لە نێوانیان نەكرێ، دەبێت هەموان لە ڕووی ئابووریەوە یەكسان بن١١٢. بەمجۆره گونجانی بۆچوونی خەواریج لەگەڵ كورد دا بە جۆرێك بوو كە خەواریجەكان بتوانن سوپا لە عەرەبو لە نەتەوەكانیتر بە بێ جیاوازی پێك بهێننو وەك یەك جەستە دژی دوژمنەكانیان بجەنگن١١٣. هەروەها خەواریجەكان ئەو هەستەیان لەلا دروستبوو بوو كە پارێزەری لاوازو چەوساوەنو لە دژی ستەمكاران دەجەنگن١١٤.
ئەمەش لە ووتارێكی ساڵحی كوڕی مەسرەح دا دەردەكەوێت كە سەركردەی خەواریجەكانی هەرێمی جەزیره بوو لە سەردەمی عەبدولمەلیكی كوڕی مەرواندا، ئەو ڕوودەكاتە شوێنكەوتوانیو دەڵێت:" نازانم چاوەڕێی چین ؟ ئێوە لە بەردەم ستەمو چەوسانەوەدان، والییەكان دوور كەوتوونەتەوە لە ڕاستیو گومڕا بوونو ستەم لەخودا دەكەن، هەڵسن بڕۆن بۆ لای براكانتان، ئەوانەی دژی ناڕەواییو بانگەشەی ڕاستی دەكەن، هەروەك ئەوەی ئێوە دەتانەوێ"١١٥. لە بەرئەوە بەشداریكردنی كورد لەو بزووتنەوانەدا زۆربەی كات توندی سیاسەتی دەوڵەت بووە لە سەپاندنی باجو خەراجو توندو تیژی والییەكانیان

# باسی چوارەم:

# تایبەتکارەکانی نەتەوەی کوردو ڕۆڵیان لە پەیوەندی بزووتنەوەی خەواریجدا

## یەکەم: فاکتەری جوگرافی لە پەیوەندی کوردو بزووتنەوەی خەواریجدا

شوێنی جوگرافیی هەرێمە کوردنشینەکان وەك نێوەندێکی چڕو سەختو دوور لە دەسەڵاتی نێوەندیی، ڕۆڵی کاریگەریان هەبوو بۆ ئەوەی خەواریجەکان چالاکی فراوانیان بۆ هەرێمە کوردییەکان بگوازنەوە١١٦. چونکە دووری هەندێك لە هەرێمە کوردیەکان لە وانە ( شارەزوور)، وەك شوێنێکی دوور لە بنکەی خەلافەتی ئیسلامیی، کە ئەوکات لە دیمەشق بوو، زەمینەیەکی لەبار بوو بۆ گواستنەوەی چالاکی خەواریج بۆ ناوچەی ناوبراو١١٧، ئەم هۆکارە بوو شارەزووری کردە پێشەنگیی ناوچە کوردییەکان لەڕووتێکردنی خەواریجو ئامێز بۆ کردنەوەیان هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیانەوە١١٨، لەلایەکی ترەوە شارەزوور هەڵکەوتەی شوێنەکەی زۆر سەخت بوو١١٩. هەروەها زنجیرە چیای سەختو شوێنگەی حەشارگەی زۆریشی لێ بوو١٢٠، ئەم هۆکارانە بوون بە زەمینەیەك بۆ بڵاوکردنەوەی بیری خەواریج لەو ناوچەیەدا١٢١، تەنانەت هەرێمی شارەزوور بوو بە ئارامگەو شوێنی حەشاردراوی خەواریجەکان بە درێژایی سەردەمی ئومەویەکان، هەروەها بوو بە بنکەیەکیش بۆ چالاکیو ڕێکخستنەوەی هێزەکانی خەواریج١٢٢، چونکە بۆ

ئومەویەکان ئاسان نەبوو زاڵبن بە سەر هەرێمە دوورەکان بۆ لە ناوبردنی خەواریج، ئەمانە هەمووی هۆکاری جوگرافی بوو وای کرد لە خەواریجەکان ناوچە کوردیەکان بکەنە پەناگەیەکو لە ناو کوردەکاندا بژینو تێکەڵ بەئاکارو بیرکردنەوەی یەکتری ببنو تەنانەت ببنە هاوکارو هاوسەنگەری یەکتریش. سەرچاوەکان دەڵێن کوردەکان تێکەڵی ڕیزەکانیان بوونو توانیان بە هاوکاری بزووتنەوەی خەواریج ببنە فاکتەری لاوازی دەوڵەتی ئومەوی١٢٣.

چونکە بەردەوام سەرپێچیو لادانەکانی والییەکان هێزی بەرهەڵستکاریی لەنێو نەتەوە ناعەرەبەکاندا زیندوو ڕاگرتبوو، ئەم زیندووییەش لە پشتیوانی خەواریجەکاندا خۆی بینیەوە و بووە هۆی ئەوەی سنووری چالاکی خەواریج تەنها لە کوفەو شامو موسڵدا نەوەستێتەوە، بەڵکو بانگەوازەکەیان برایە ناوچەی چیاکانو ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکان، خەواریجەکان ئەوێیان وەك شوێنێکی جیۆپۆلەتیکی لەبار هەڵبژارد، تا چالاکیە سەربازیەکانی خۆیان لەوێوە ڕێك بخەنەوە١٢٤

ئەم هۆکارانە بوو وایکرد پەیوەندیکردن بە ناوچە کوردیەکانەوە بەشێك بێت لە بەرنامە سەرەتاییەکانی خەواریج، ئەوەبوو لە سەرەتاوە پەیوەندییان کرد بە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکانەوە، بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە ڕیزەکانی سوپای خەلیفە عەلییان بەجێ هێشتو لە ماڵی سەرکردەکەیان عەبدوڵلای کوڕی وەهب کۆبوونەوە، ئەویش پێی وتن : "داواکانمان ببەنە دەرەوەی ئەو دێیەی کە خەڵکەکەی ستەمکارن بۆ هەندێ لە کورەی چیاکان یان بۆ هەندێ لەو شارانەی دووره پەرێزی ئەو بیدعەو ستەمەن"١٢٥. چونکە چیاکان تەنها قەڵغانی پاراستنیان بوو لە سوپای دەوڵەت ١٢٦.

## دووەم: فاکتەری کلتوری کورد لە پەیوەندی بزووتنەوەی خەواریجدا

پاش دەستپێکردنی پرۆسەی بە ئیسلامکردن‌و ئیسلامبوونی هەرێمە کوردنشینەکان لە سەردەمی هەردوو ڕاشیدین‌و ئومەویەکاندا، ئیتر تێکەڵکردنی نەتەوەی عەرەب لەگەڵ غەیری خۆی ڕووبەڕووی پرۆسەیەکی کلتوری نوێ بوویەوە، کە ئەمەش دەرهاویشتەکانی لە دوای پرۆسەی فتوحات‌و لەسەرخۆ دەردەکەوتن، لەوێدا هەموو ئەو میللەتانەی جیاوازبوون‌و خاوەنی شارستانیەتی کۆن‌و ئایینی خۆیان بوون، حاڵەتێکی کۆمەڵایەتی نوێ‌و غەوارە ڕووی لێکردن، لێرەشەوە چەند یەکەیەکی کۆمەڵایەتی نوێ سەریهەڵدا، کە پەرەسەندنیان بوو بە مەترسی‌و تەقینەوەیەکی فیکری بۆ سەردەوڵەتی خەلافەت١٢٧.

سەبارەت بە کوردیش ئاشکرایە پێش ئیسلام خاوەنیی کلتوورو ئاینی خۆیان بوون. بە تایبەتی زەردەشت پێکهاتەی ڕۆحیی نەتەوەی کوردی پێك هێنابوو١٢٨، ئەم ئایینە توانیبووی تا ڕادەیەك جێگای خۆی لە هەست‌و نەستی مرۆڤی کوردا بکاتەوە١٢٩، لەبەرئەوە کلتووری کوردی پێش ئیسلام کلتورێك بوو بنەماکانی خۆیان لە بیروباوەڕەکانی زەردەشت‌و مەزدەیەکدا دەبینیەوە١٣٠. بەڵام کاتێك کە ئایینی ئیسلام دێت و پرۆسەی ئیسلامکردن دەگاتە کوردستان، ئەم پەیامە جێگای پەیامی زەردەشتی‌و مەزدەیەکیەت‌و ئاگرپەرستی دەگرێتەوەو دەبێتە پەیامی ڕۆحی کورد، لەگەڵ ئەوەشدا ئایینە کوردیەکان لە نێوچوون، بەڵام ئەم لەنێوچوونە تەنها بواری پەرستش‌و تقوسی دینی کوردی نەگرتەوە، بەڵکو ئەو لەنێوچوونە سەرەتایەك بوو بۆ تێکشکاندنی زمان‌و هۆکاری بەرجەستەکردن‌و دەربڕینی کلتوری کوردیش١٣١، لەگەڵ ئەوەشدا دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلامیش ئەو دەسەڵاتە نەبوو کە خودی ئیسلام‌و بنەماکانی وەك پرۆژەیەکی ئینسانی‌و ڕۆشنبیری‌و فیکری داوای دەکرد، لە ڕاستیدا ئیسلام‌و غەزاکەرانی عەرەبی لە پاش فتوحاتدا ژیانی مەدەنی‌و کارگێڕی خۆیان وەك دەوڵەتێ دەرخست کە بەناوی ئایین‌و دروشمی ئیسلامەوە بانگەشەی دەکرد١٣٢. ئەمەش لە باری یەکەمدا بەشی هەرە زۆری داب‌و نەریت‌و کلتوری کوردی‌و کۆمەڵگای کوردی‌و کتێبخانەو

دەستنوس‌و فەرهەنگە جیاجیاو پلورالیزمەکانی دنیای کوردی دایە دواوەو سەرنجی تەنها بۆ یەك قیبلەو فەرهەنگ‌و ئەدەبیات ڕاکێشا١٣٣. لەبەرئەوە پەیامێکی وەك ئیسلام کە دێتە کوردستانەوە کلتووره جیاوازەکان ڕاڤەیەکی تر بۆ دەقەکانی پەیامەکەی دەکەن، لێرەشەوە جیاوازی تێڕوانینی سیاسیانە سەرهەڵدەدات، کەواتە سەرهەڵدانی هەرگروپێکی سیاسیی جیاواز لە دەسەڵاتی خەلافەت، بە دڵنیاییەوە جیاوازیەکی کلتووریشی لە پشتەوە هەیە١٤٤، ئەوەبوو لە سەردەمی ئومەویەکاندا کلتوورەکانی دەرەوەی عەرەب بەردەوام بۆ سەلماندنی بوونی خۆیان چەندەها شۆڕشی یەك لە دوای یەکیان کرد١٣٥. خەواریجەکانیش کاتێك لە سەرەتای سەدەی دووەمی کۆچی بەناوی بیروباوەڕی ئیسلامەوە بانگەوازیان بۆ یەکسانی نێوان مەوالی و عەرەب دەکرد، هەربۆیە مەوالییەکانیش پشتیان گرتن، بەلام لە ڕاستیدا هێزی ئەم پشتیوانییە درێژە دان بوو بە بزووتنەوە کۆمەلایەتییەکانی سەردەمی ساسانەکان، چونکە ئەو بزووتنەوانە بەشێوەیەکی نهێنیی‌و بە بۆیاخیی جیاجیای ڕوویانەوە کاریان دەکرد١٣٦، لەبەرئەوە دەرکەوتنی بزووتنەوەکانی خەواریج لە ناو مەوالییەکاندا بە ناوی بانگەشە بۆ یەکسانی‌و دادگەریی ئیسلام، پارێزگاری بوو لە بۆچوونە کۆنەکان، کە لە ڕۆحی خەڵکی ئەوێدا هەبوون‌و هێشتا هەناسەیان دەدا، ئەو بزووتنەوانە بە شێوەیەکی نهێنی هەوڵی گەڕانەوەی هەیمەنەی خۆیان دەدا١٣٧، چونکە ئەو یەکسانییەی کە خەواریج بانگەشەی بۆ دەکرد یەکێك بوو لە بنەماکانی بزووتنەوەی مەزدەکییەت کە چەند سەدەیەك پێش خەواریجەکان لەو هەرێمانەدا خۆی ڕاگەیاندبوو، مەزدەك ڕێگای دەدایە حەلالکردنی مالی مرۆڤ بۆ یەکتری‌و دەیووت سەروەت‌و سامان مولکی خودایەو بۆ گشت مرۆڤە١٣٨، هەروەها دەیووت:" خەلك هاو بەشن لە ژن‌و ساماندا، هەروەك چۆن لە ئاو و هەواو شتەکانی تریشدا هاوبەشن" ١٣٩. ئەم بنەمایانە هەمان بیروباوەڕەکانی خەواریج بوون، بە پێی وتەی شەهرستانی "مەزدەکیەت لە شارەزوور بلاوبووەتەوە" ١٤٠، ئاشکرایە زۆربەی خەواریجەکانیش لە شارەزووردا بوون،

لە بەرئەوە دەگونجێ خەواریجەکان کەوتبنە ژێر کاریگەری بیروباوەڕو کلتووری کوردەکانەوە، چونکە ڕاستە مەزدەکییەت ئەوکاتە لە ناوچوو بوو، بەڵام وەکو ڕەوتێکی نهێنی دەژیاو مابویەوە، تەنانەت هەروەك ڕۆژانی فەرمانڕەوایی ساسانییەکان بنەما کلتورییەکانی کاریان دەکرد، لێرەو لەوێش لەسەردەمی ئیسلامدا خۆی ئاشکرا دەکردو بە بەرگو بۆیاخی نوێوە لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکی یەکسانی خوازیدا دەستیان پێدەکردەوە، تەنانەت هەندێ لە شارەکانی فارس کە کوردی تیادا نیشتەجێبوون تا سەردەمی عەباسییەکان لەسەر ئەو بڕوایە بوون، بەڵام لە سەردەمی عەباسیەکاندا لە ناوبران١٤١.
هەروەها ڕۆژهەڵتناس ( الهاوزن) لەمبارەیەوە دەڵێ:" خەواریجەکان لە سەرەتادا لە عەرەبە کۆچەرییەکان پێك هاتبوونو تەنانەت بەشداریی جەنگەکانی دژ بە فارسیان کردبوو، هەر بۆیە لەگەڵ خۆشیاندا زۆربەی نەریتەکانی کۆچەرییان گواستەوە لە یەکسانیو پێکەوە ژیانو دەمارگیری خێڵایەتی"
هەر بۆیە دوواتر زۆربەی ئەمانە لە عێراقو ڕۆژهەڵات دەردەکەوتن، چونکە خەڵکی نا موسڵمان زۆرینەیان لەوێ بوونو کاریگەری زۆریان لە سەر خەواریج هەبوو، بە تایبەتی کاریگەری ئایینی زەردەشتیو مەسیحیو ئایینە کۆنەکانی ئەوێ١٤٢، لە بەرئەوە پێدەچێت یەکسانی خوازی خەواریجەکانی لە مەزدەکەکانەوە بێ، چونکە تا تێکەڵی مەوالییەکان نەبوون نەیان دەوت پێویستە خەلیفە تەنها موسڵمان بێت، بەڵکو دەیان ووت دەبێت تەنها عەرەب بێت١٤٣، چونکە مەزدەکیەتیش جیادەکرایەوە بە مەرامە ئیشتراکییەکانیو داکۆکیی تەواوی دەکرد لە یەکسانی ژیانو هاووبەشی ئابووریدا١٤٤، مەزدەکیش هەروەك خەواریج تەنها بەوە جیا دەکرێنەوە لە بیری ئیشتراکی نوێ، کە بۆیاخێکی ئاینیی کراوە بە بەریاندا١٤٥.
بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی پەیوەندیەکانی کوردو خەواریجو گەڕاندنەوەی ئەو پەیوەندییەیان بۆ ڕاڤەیەکی کلتووری نمونەیەك دەخەینە ڕوو، بۆ نمونە جارێکیان ئەبوزەری غیفاری بۆچوونێکی خۆی سەبارەت بە ماڵو سامان

دەڵێت بە خەلیفە عوسمان، عوسمانیش لە وەڵامدا دەڵێ ئەوەی کە وترا بۆچوونێکی مەزدەکیانەیە، تۆ لەکوێت هێناوە ؟ تەبەری لەم بارەیەوە سەرگوزەشتەیەکی باسکردووەو ڕاستی بۆچوونەکەی عوسمانمان بۆ دەسەلمێنێتو دەڵێ عەبدوللای کوڕی وەهب دەگات بە ئەبوزەری غیفاریو سەرنجەکانی خۆی پێدەڵێت، هەروەها هەمان بۆچوونیش دەڵێ بە ئەبودەرداو عوبادەی کوڕی سامت، بەڵام ئەوان بەگوێی ناکەن، ئیتر عوبادە لەتەك خۆیدا قسەکانی عەبدوللا دەبات بۆ لای موعاویەو پێی دەڵێت کە عەبدوللا بۆچوونەکانی خۆی گەیاندووە بە ئەبوزەرو کاری لێکردووە دیارە عەبدوللا دامەزرێنەری بزاڤی خەواریج بوو، لە مەوە دەردەکەوێت کە بۆچوونە یەکسانی خوازییەکانی خۆی لە مەزدەکەکانەوە وەرگرتبێ لە عێراقو یەمەن١٤٦، ئەو بۆچوونانەی لە ناخی کوردەکانی ئەو قۆناغەدا چەسپیبوونو ببوویە کلتوورێکی لە یاد نەکراویان، هەر بۆیە دەگونجێت، ئەو فەرهەنگەی خۆیان تێکەڵ بە پەیامی ئیسلامیی کردبێتو خواستی ئیسلامێکی بە کوردی کراو لایان بەبایەخ بێت تا ئەو ئیسلامەی عەرەبەکانی بنەماڵەی ئومەوی بە بەرگێکی عەرەبییەوە دەیانگەیاند.

## سێ هەم : پێکهاتەی هۆزایەتی کوردو شوێنی لە پەیوەندیەکانی بزووتنەوەی خەواریجدا

پێکهاتەی هۆزایەتی ناوچە کوردیەکان یەکێکی تربوو لە هۆکارەکانی پەیوەندی کوردو خەواریج، هەربۆیە یارمەتی دەری بزاڤی خەواریج لە هەرێمی جەزیرەو موسڵ دا وەك دوو شوێنی سەرەکیی کوردەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پێکهاتە هۆزایەتییەی کە بەردەوام لە ناوچەکەدا هەبوو، چونکە ئومەویەکان هەرلە سەرەتاوە دەیانویست ماناو مەفهومەکانی دەوڵەت لەلای هۆزەکان بچەسپێنن، ئەمەش لە پێدا گرتنیانەوە بوو لە حوکمی ناوەندی دەوڵەت١٤٧، بەڵام خەواریجەکان هەستێکیان هەبوو لە نەچوونە ژێر حوکمی ناوەندیی١٤٨.

بۆ ئەم مەبەستەش خەواریجەكان كاریان كرد بـۆ بڵاوكردنـەوەی داواكـەیان لـە نـاو هۆزەكانـدا، چـونكە لەگـەڵ بۆچـوونەكانیان دەگونجـان١٤٩، هەربۆیـە كوردەكانیش هەمان هەڵوێستیان هەبوو لـە نەچـوونە ژێـر بـاری سـنوورەكانی خەلافەتو ڕژێمی ناوەندی، ئەم هەڵوێستەش یاقوتی حەمـەوی لـە بارەیـەوە دەڵێت: "سەرپێچیان كردبوو لە سوڵتان بەهۆی ناكۆكی نێوان ئەوانەی سەرپێچیان كردبوو پێشترو سزا درابوون"١٥٠

لە بەرئەوە یەكێك لە هۆكارەكانی پەیوەندی كوردو خەواریج لە ناو هۆیەكانی تردا بریتیە لە دەمارگیری هۆزایەتی كورد١٥١، هەربۆیە چالاكیو بڵاوبوونەوەی خـەواریج لە ناو كورد دا دەگەڕێتەوە بۆ پێكهاتە هۆزایەتیەكەیان، چونكە ملكەچ نـەبوون بـۆ دەوڵەت هەروەك چۆن خەواریجیش ملكەچ نـەبوون١٥٢، لـە بەرئـەوە لـە نـاو هـۆزە كوردیەكان كاریان كرد بۆ بڵاوكردنەوەی داواكەیانو سەركەوتوش بوون١٥٣

## چوارەم شوێنی پێكهاتەی كۆمەڵایەتی كورد لە پەیوەندیەكانیان لەگەڵ بزووتنەوەی خەواریج

زۆری هـۆزە عەرەبیـەكان لـە دەورووبـەری موسـڵو جـەزیرەدا كاریگەرییـەكی بەرچـاوی لەسـەر هـۆزە كوردیـەكانی ئـەو ناوچـانە بـە جێهێـشت، ئـەم كاریگەریەش دەگەڕایەوە بۆ نزیكی شوێنی جوگرافیو دراوسێ بوونیان لەتـەك هۆزە عەرەبیەكانی یاخی لە ئومەویەكان، هۆزە عەرەبیەكانیش بریتـی بـوون لە ( بنی شیبان، بنی تغلب، بنی الازد)، هەریەك لەم هۆزانەش ناسرابوون بە ئەنجامـدەرانی زۆرینـەی شۆڕشـە خەواریجیـەكان، ئەمـە لەلایـەك، لەلایـەكی ترەوە هەرێمی جـەزیرە لـە ڕووی پێكهاتـەی ئیتنیـەوە بریتـی بـوو لـە كـوردو عـەرەبو ئەرمـەنی، هەربۆیـە سروشـتێكی جیـاوازی هـەبوو لـە سـەرهەڵدانی شۆڕشـدا١٥٤. لـەم كاتەشـدا كوردەكـان بوونـە پـشتگیری ئـەو خەواریجـە هەڵهاتووانەی كە لە جەزیرەدا بوون، هـەروەها شارەزووریـشیان كـردە بنكـەی

چالاکییەکانیان١٥٥، لە کاتێکدا کوردەکان لایەنگیری ئومەویەکان بوون، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خو ونەریتو عورفی کۆمەڵایەتیان لە بە ماناوەچوونی لاوازان و پارێزگاری لێ قەوماوان، بۆ نمونە ( القزوینی ) لە وەسفی خو و نەریتی کورد دا دەڵێت: " کوردەکانی ( بشنونە) ئەوانەی لە پێش ئیسلامدا لە جەزیرەدا دەژیان، قەومێکن داکۆکی لە پاراستنی لێ قەوماوان دەکەن" ١٥٦.
بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیەش دەبینین پشتگیریکردنی کوردەکان بۆ عەباسیەکانو سەرکەوتنی بانگەوازەکەیان بە یارمەتی کورد بوو١٥٧.
کەچی لەلایەکی ترەوە دەرگای ناوچەکانیان والآدەکەن لە بەردەم ئومەویە هەڵهاتووەکان١٥٨.
دیارە بەشێوەیەکی گشتی لە پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکاندا هۆزی ( بنی شیبان) کە هۆزێکی عەرەبی بوو لە هەرێمی جەزیرەدا ڕۆڵی هەبوو لە نزیکبوونەوە لە تەك کورد، چونکە دوو لە سەرکردە گەورەکانی بزووتنەوەی خەواریج سەعیدی کوڕی جەدلو زوحاکی کوڕی قەیس لەو هۆزەبوون.
لە بەرئەوە پەیوەندیەکانی کوردو ئەم هۆزە پەیوەندی یەکی زۆر باش بوو، تەنانەت لە ناو کوردەکانی شارەزووروو ( بنی شیبان)دا بازرگانی هەبوو١٥٩، هەروەها بە هۆی ژنو ژنخوازیشەوە هۆکاری بەشداری کورد لە بانگەوازەکەیان زیادببوو ١٦٠.

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١.محمد امین زکی: کوردو کوردستان، چاپخانەی دار السلامی بغداد، ١٩٣١، لا ١٢٥.
٢. محمد جاسم حمادی: الجزیره الفرادتیه والموصل،دارالرساله، بغداد، ١٩٧٧ز،لا ٤٤
٣. هەمان سەرچاوە، لا٤٥.
٤. شوان عوسمان مستەفا: کوردستان‌و پرۆسەی بەئیسلام کردنی کورد، چاپی یەکەم، سلیمانی، ٢٠٠٢، لا ١٨
٥. محمد امین زکی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٥.
٦. فائزه محمد عزت الکرد فی اقلیم الجزیره وشهرزور، رساله ماجستیرعلی الاله الکاتبیه، کلیه الاداب، جامعه صلاح الدین، ١٩٩١، لا ٤.–٥..
٧. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٥.
٨. فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا.٥.
٩. ابن حوقل صورة الارض، دار المکتبة الحیاة، بیروت، ١٩٧٩، لا ٣١٥.
١٠. شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦
١١. عبد الماجود احمد السلمان: الموصل فی العهدین الراشدی و الاموی، رساله غیرمنشور، کلیه الاداب، جامعه الموصل،١٩٨٣، لا ١٣٩.
١٢. یاقوت الحموی: معجم البلدان، دار الصادر، بیروت، دون التاریخ، ج ٣،لا ٣١٧.
١٣. القزوینی: اپار البلاد واخبار العباد، دار الصادر، بیروت، ١٩٦٠، لا ٣٥٧.
١٤. شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٧
* شهرزور: سەبارەت بە ناوی ئەم شارە ئەوە مێژوونوسان‌و جوگرافیناسان بۆچوونی جیاجیان هەیە، هەندێك دەڵێن ناوی شارەزوور لە( شهر زور) ەوە هاتووە کە شەهر لە زمانی فارسیدا بە واتای شار دێت، هەروەها ناوی زووریش دەگەڕێتەوە بۆ(زوری کوڕی زوحاك) کە شارەکەی دروستکردووە ( یاقوت حموی: معجم بلدان، ج ٣، لا ٣٧٥" حسام الدین النقشبندی: شهرزور فی محافظه السلیمانیه، مجله کاروان، عدد٦٦، بغداد، ١٩٨٨، لا١٤٩.
* کرخ بدان: شارێکی بچوکە لە نزیك خانەقین وەکو سنورێك وایە لە نێوان هەرێمی عێراق‌و شارەزووردا : ( یاقوت حموی: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ٤٤٩ ).
* داقوت: شارێکی ناسراوە دەکەوێتە نێوان ( اربل، بغداد)، ( یاقوت حموی: سەرچاوەی پێشوو، ج ٢، لا ٤٥٩.

* باجەرمێ : ناوچەیەکە لە ڕۆژهەڵاتی بغداد دایە لە نێوان ئەم شارەو حولوان ٦کم دوری هەیە: (یاقوت حموی : سەرچاوەی پێشوو ج ١، لا ٣١٢ ).

١٥. مینورسکی دائره معارف المعارف الاسلامیه، ماده شهرزور، معجم ١٣، لا ٤٨٨

١٦. یاقوت الحموی: سەرچاوەی پێشوو، ج ٣، لا ٣١٧

١٧. ابن حوقل: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣١٥

١٨. الاصطخری: المسالك والممالك، دار الصادر القاهرة، ١٩٦١، لا ١١٨" حیسام الدین علی غالب النقشبندی: الکرد فی الدینور والشهرزور، رسالة ماجستیر غیر منشور، جامعة البغداد، ١٩٧٥، لا ٤٨.

١٩. حسام الدین علی غالب: هەمان سەرچاوە، لا ٤٨.

٢٠. احمد میرزا: غربی اقلیم الجبال فی صدر الاسلام، رساله ماجستیرغیر منشور، کلیه الاداب، جامعه صلاح الدین، اربیل، ١٩٩٤، لا ٢٣

٢١. هەمان سەرچاوە، لا ٢٣

٢٢. ابن حوقل: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢,٤

٢٣. هەمان سەرچاوە، لا ٢,٥

٢٤. جمال رشید احمدو فوزی رشید: تاریخ الکرد القدیم، اربیل، ١٩٩٠م، لا ٣٩

٢٥. احمد میرزا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٣

٢٦. الیعقوبی: تاریخ الیعقوبی، دار الصادره بیروت، ١٩٦٠، لا ٢٣٦.

٢٧. وەرگیراوە لە شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٢.

٢٨. فاروق عمر: تاریخ الخلیج العربی فی عصور الاسلامیة الوسطی، دار واسط، بغداد، ١٩٨٥، لا ٩٤.

٢٩. هەمان سەرچاوە، لا ٩٥.

٣٠. شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٢.

٣١. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٥، لا ٤٨.

٣٢. زبیر بیلال اسماعیل، الاکراد فی مکتب بلدانین والرحاله المسلمین فی العصور السنی، اربیل، ١٩٨٩، لا ٦٣

٣٣. هەمان سەرچاوە، لا ٦٤.

٣٤. هەمان سەرچاوە، لا ٦٣

٣٥. ابن حوقل: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٠٠ الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٤، لا ٦٨.

٣٦. شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٥

۳۷. بەدلیسی ( میر شەرەفخان)، شەرەف نامە:  وەرگێڕانی هەژار موکریانی، نەجەف، ۱۹۷۳، لا ۱۲۱
۳۸. البلاذری: فتوح البلدان، دار الکتب العلمیة، بیروت، ۱۹۷۸ز، لا ۳۲۱
۳۹. کوثر اسماعیل حسین    الحیاة الاقتصادیةو الاجتماعیةفی اقلیم ازربایجان واران، رسالة ماجستیر غیر منشورة، جامعة صلاحدین، ۲۰۰۲، لا ۲۵.
٤۰. هەمان سەرچاوە، لا ۲۱.
٤۱. القزوینی: سەرچاوەی پێشوو، لا ۲۸٤.
٤۲. هەمان سەرچاوە، لا ۲۸۵.
٤۳. کوثر اسماعیل حسین، سەرچاوەی پێشوو، لا٤۵.
٤٤. شوان عسمان مستەفا: : سەرچاوەی پێشوو، لا ۸۳.
٤۵. هەمان سەرچاوە، لا ۸۳-۹.

* سیاسەتی ئومەوییەکان بەشێوەیەکی گشتی سیاسەتێکی دوور لە ئسیلامو ستەمکارانە بووە، ئەم ڕاستیەش هەر لەسەرەتاوەو لەڕەدکردنەوەی شوراو ڕاوێژەوە ڕوونبوویەوە، بەلأم مێژوونوسان بۆچونیان لە مەڕ ئیجابیاتو سلبیاتی سیاسەتی ئومەویەکان بەدوو ئاراستە ئامارە دەدات، ئامارەی یەکەم لەو ڕوانگەیەوە تەماشا دەکات کە دەوڵەتی ئومەوی لە سەرەتاوە تا کۆتای دەوڵەتێکی چاکو ڕاستە کە ئەمانە زیاتر ئەو مێژوونوسانەن کە دەمارو هەستی عروبە دەیانجوڵێنێت، ئامارەی دووەم دەڵێ ئومەویەکان لادەروو دوور لە سونەتو ڕێبازی ئیسلام بوون، دیارە کە زۆرینەی ڕاستیەکان لە بۆچوونی دووەمدا کۆبووەتەوە (علی الوردی: سەرچاوەی پێشوو، لا ۸۳)
٤٦. الخربوطلی: سەرچاوەی پێشوو، لا ۱۹۰.
٤۷. بیرو باوەڕی کوردەواری، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦۵، هەولێر، ۲۰۰۱، لا ۲۳
٤۸. عبد الحسین زرین کوب: دو قرن سکوت سرگزشت حوادپ واوچاع تاریخی ایران دردوقرن اول اسلام، کتابخانە ملی ایران، تهران، ۱۳۷۱، لا ۹۲ ۲.
٤۹. هەمان سەرچاوە، لا ۱,۲.
۵۰. شوان عسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، ۲۵٤
۵۱. لطیفة البکاوی: حرکة الخوارج، لا ۱۸٦
۵۲. حسن پیرنیاو اقبال اشتیانی: تاریخ ایران، از اغاز تا انقراج ساسانیان، جلد اول، چاپ دوم، ۱۳۸۲، تهران، لا ۳۳۲.
۵۳. نوری جعفر: الصراع بین الاموین ومبادی الاسلام، ت ۱، القاهرە، ۱۹۷۸، لا ۱۱۷.

٥٤. الخربوگلی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٢

٥٥. حسن ئیرنیاو اقبال اشنبانی، تاریخ ایران، لا ٩٣

٥٦. عزیز العظمة: ابن خلدون، ت ١، دار الصادر الریاض، ٢...، لا ١٦٣

٥٧. حسن پیرنیا : سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٣٢.

٥٨. عبد العزیز الدوری: الجزور التاریخیه للشعوبیه، ت ١، بیروت، ١٩٦٢، لا ٢

٥٩. ابن خلدون: المقدمه، لا ٥٤٣

٦٠ نوری جعفر: صراع بین الامویین ومبادی الاسلام، لا ١١٧.

٦١. عبد العزیز الدوری: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢.

٦٢. حسن پیرنیاو عباس اقبال اشتیانی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١،٢.

٦٣. عبد العزیز الدوری، س.پ، لا ٢.

٦٤. عەتا قەرەداغی: کاریگەری کلتوری ئەوان لەسەر کورد، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، سلیمانی، ٢..١، لا ٦٩

٦٥. الخربوگلی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٦٥.

٦٦. عبدالطیف الطیباوی: محاضرات فی تاریخ العرب والاسلام، ت ١، بیروت، ١٩٦٣، لا ٢٧٠

* سەبارەت بەرێنوسی کوردی (احمد بن ابوبکر النبتی) دەڵێ: لە دەورووبەری سەدەی دەیەمی پێش زایینی (ماسی سورات) جۆرە پیتێکی داهێنا، ئیتر کورد بەو پیتانە نوسیویانەو هەربەناوی داهێنەرەکەشیەوە ناونراوە ئەم پیتەش تا وەکو هاتنی ئیسلام کورد پێی نوسیوە: : (عەتا قەرەداغی کاریگەری کلتوری ئەوان لەسەر کورد، لا ٢٧ ) .

٦٧. هەمان سەرچاوە، لا ٦٩

٦٨. مەردۆخی تاریخ کوردو کوردستان، انتشارات غریقی، تهران، ١٣٥١، لا ٥٣

٦٩. عبدالطیف الطیباوی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٧

٧٠. موصلح مستەفا جەلالی : شوراتەکان، لا ٣٣

* سەرانە بریتیە لەوەی پێشەوای موسڵمانان رازی دەبێت بە دامەزراندنی بەڵێننامەی سەرانە لەگەڵ خاوەن کتێبەکانداو لەگەڵ ئەوانەش کە گومانیان لێ دەکرێ خاوەن کتێب بن، خودا دەفەرمێ (ما افا اللة علی رسوله من اهل القری فالله وللرسولة ولذی القربی والیتامی والمساکین وابن سبیل ( طارق حەسەن هەمەوەندی: پوختەی فیقهی شەریعەت، چاپی چوارەم، ١٩٩٨، لا ٣٤١ ).

٧١. موصلح موستەفا جەلالی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٤

٧٢. فاروق عمر: طبيعة الدولة العباسية، ت ١، دار الارشاد، بيروت، ١٩٧٠، لا ٤٢١.
٧٣. ئارشناك پالاديان: كورد لەسەرچاوە عەرەبيەكاندا، وەرگێڕانى ئازاد عوبێد، هەولێر، ١٤٢١، لا ٥٢
٧٤. كارل بروكلمان: سەرچاوەى پێشوو، لا ١٥.
٧٥. الخربوطلى: سەرچاوەى پێشوو، لا ١٧٣.
٧٦. نيكيتا ايليسيف: الشرق الاسلامى فى العصر الوسيط، لا ١٨٢.
٧٧. هەمان سەرچاوە، لا ١٨٢.
٧٨. ابن اثير: الكامل فى التاريخ، ج ٣، لا ١٥٩
٧٩. ابن كثير: البدايه والنهايه، ج ٧، ٣١٦.
٨٠. مصلح مستەفا جەلالى: شوراتەكان، لا ٣٢
٨١. حسام الدين على غالب النقشبندى: ديانه الكرد قبل الاسلامو فتح الاسلام لهم ومعتقداتهم الدينيه و المذهبية حتى اواخر القرن الخامس الهجرى فى اقليم شهرزور ولورستان، گۆڤارى هەزار مێرد، ژمارە١٩، سليمانى، ٢٠٠٢، لا ١٢٩.
٨٢. الخربوطلى: سەرچاوەى پێشوو، لا ١٨٠.
٨٣. الطبرى : سەرچاوەى پێشوو، ج ٥، لا ٧٧
٨٤. فائزه محمد عزت: الكرد فى اقليم الجزيره و شهرزور، لا ١٣١.
٨٥. صائب عبد الحميد: تاريخ الاسلام الثقافى والسياسى، لا ٧٦٤
٨٦. عبد الله حماد: التكفير والهجره، النهج، عدد ٢٧، لا ٤٨
٨٧. الطبرى سەرچاوەى پێشوو، ج ٥، ٧٤"ابن كثير: البدايه والنهايه، ج ٧، لا ٢٨٥– ٢٨٦" ابن اپير: الكامل فى التاريخ، ج ٣، لا ٦٩.
٨٨. زرار صديق توفيق: الكرد فى العصر العباسى، رساله ماجستير على الاكاتبيه، جامعه صلاح الدين، اربيل .
٨٩. عبد الله حماد: الهجره والتكفير، النهج، العدد٢٧، لا ٤٩ .
٩٠. الشهرستانى : سەرچاوەى پێشوو، ج ١، لا ١٥٨
٩١. حسن ابراهيم حسن: تاريخ الاسلام السياسى والدينى والپقافى والاجتماعى، دار الجيل، بيروت، مكتبه النهضة المصريه، القاهره، ١٩٩٦، ج ١، لا ٣٧٦
٩٢. فائزه محمد عزت: الكرد فى الجزيره وشهرزور، لا ١٢٠.
٩٣. الخربوطلى: سەرچاوەى پێشوو، لا ١٩٠ .
٩٤. هەمان سەرچاوە، لا ١٥٩

*. سەبارەت بەدەرچوون لەژێر دەسەلاتی ستەمکار خودا دەفەرمێت :( ولاترکنو الی الذین ظلموا فتمسکم النار مالکم من دون الله من اولیا ثم لا تنتصرون) قورئانی پیرۆز: سورەتی هود، ئایەتی ۱۱۳.

۹۵. علی حسن خربوطلی: عشر ثورات فی الاسلام، لا ٦٦" خالد عبدالمنعم: ظهور الخوارج، موسوعه العراق الحدیث، مج ۱، ت ۱، بغداد، ۱۹۸۱، لا ۱۲۷

۹٦. الشهرستانی، سەرچاوەی پێشوو، ج ۱، لا ۱۵۷

۹۷. محمد عبد الله عوده واخرون، مختصر التاریخ الاسلامی، ت ۱، عمان، ۱۹۸۹، لا ۷۷

۹۸. عبد العزیز الدوری، الجزور التاریخیه، لا ۱۵

۹۹. وەرگیراوەلە، الخربوطلی: سەرچاوەی پێشوو، لا ۱٦..

۱... الشهرستانی : سەرچاوەی پێشوو، ج ۱، لا ۱۵۸

*الاباضیة : بۆ تێگەیشتن لەم ڕەوتە بڕوانە بەشی یەکەم باسی سێهەم، گروپەکانی .

* سنجار: شارێکە دەکەوێتە خۆرئاوای موسڵو نزیکی شاخێکە هەر بەناوی خۆیەوە، سنجار یەکێکە لەو شارانەی کە کوردی لێ نیشتەجێیە: (فائزه محمد عزت: الکرد فی اقلیم الجزیره، لا ٥٤

۱,۱. وەرگیراوە لە مصلح مستەفا جەلالی: شوراتەکان، ۱۳٤

۱,۲. الشهرستانی: سەرچاوەی پێشوو، ج ۱، لا ۱۵۸

۱,۳. مصلح مستەفا جەلالی : سەرچاوەی پێشوو، لا ۱۲٤.

۱,٤. وەرگیراوەلە رەشاد میران، ڕەوشتی ئاینی و نەتەوەی لە کوردستاندا، چاپی دووەم، سەنتەری برایەتی، کوردستان، ۲...، لا ۹۳.

۱,۵. المسعودی : سەرچاوەی پێشوو، ج ۲، لا ۱,۱

*السن . شارێکە ئێستا پێی دەڵێن (الفتحه) ئەم شارە لە کەناری دیجلەو لە سەروی (تکریت)دایە: ( یاقوتالحموی: معجم البلدان، ج ۳، لا ۲۸٦ ).

۱,٦. المسعودی: سەرچاوەی پێشوو، ج ۲، لا ۱۳۵

۱,۷. زرار صدیق توفیق: الکرد فی العصر العباسی، رساله ماجستیر علی الاله الکاتبیه، کلیه الاداب، جامعه صرحدین، اربیل، ۱۹۹٤، لا ۹٤

*. داقوت کە بە (تاوغ) ناسراوە، لە نێوان اربیل و بغداد دایە ( یاقوت الحموی: سەرچاوەی پێشوو، ج ۱,٦، لا ٤۵۹ ).

۱,۸. حسام الدین علی غالب النقشبندی: الکرد فی الدینور وشهرزور، لا ٤٦-٤۷.

۱,۹. وەرگیراوەلە زرار صدیق توفیق: الکرد فی العصر العباسی، لا ۹۵

۱۱.. وەرگیراوەلە فائزه محمد عزت : الکرد فی اقلیم الجزیره، لا ۱۱۱

١١١. هەمان سەرچاوە، لا ١١١

١١٢. مصلح موستەفا جەلالی: شوراتەکان، لا ١٢١

١١٣. هەمان سەرچاوە، لا ١٢١.

١١٤. عبد الماجود احمد السلمان، الموصل في عهدين الراشدی والاموی، لا ١٧٧

١١٥. الطبری : تاريخ الرسل و الملوك، ج ٤، لا ٢١٨-٢١٩

١١٦. ياقوت الحموی، معجم البلدان، ج ١، لا ١٢٨

١١٧. مينورسكی، دائره المعارف الاسلاميه، ماده شهرزور، مج ١٣، لا ٤٢.

١١٨. ابن اپير : الكامل فی التاريخ، ج ٣، لا ٣٧٣.

١١٩. مينورسكی: سەرچاوەی پێشوو، مج ١٣، لا ٤٢.

١٢٠. هەمان سەرچاوە، لا ٤١٨

١٢١. زرار صديق توفيق: الكرد فی العصر العباسی، لا ٩٣

١٢٢. مينورسكی: سەرچاوەی پێشوو، مج ١٣، لا ٤١٨.

١٢٣. قحطان عبدالستار الحديثی حركات الخوارج فی خراسان فی قرنين الثانی والثالث للهجرة، مجلة الاداب، دار الطباعة الحديث، جامعة البصرة، العدد٦، السنة الخامس، ١٩٧٢، لا ٤٧

١٢٤. المسعودی : مروج الذهب، ج ٢، لا ٤،٥، احمد ميرزا: غربی اقليم الجبال، رساله غير منشوره، جامعه صلاح الدين، ١٩٩٥، لا ١١٣

١٢٥. الطبری : التاريخ، ج ٥، لا ٧٤، ابن كپير: البدايه والنهايه، ج ٧، لا ٢٨.، ابن كپير : الكامل، ج ٣، لا ٦٩

١٢٦. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج ٥، لا ٣٥. .

١٢٧. بندلی جوزی: من تاريخ الحركات الفكريه فی الاسلام، دار الروائع، بيروت، لا٤٤.

١٢٨. ايت الله مردوخ : تاريخ كردو كردستان، لا٤٨.

١٢٩. عەتا قەرەداخی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٢.

* مەزدەك بزووتنەوەیەكی سیاسیو ئایینیو ئابوریو كۆمەڵایەتی بوو لە سەردەمی ساسانیەكانو لەسەر دەستی نیسابور و لەسەردەمی قوبادی ساسانیدا سەریهەڵدا، بەشێوەیەك كە زۆربەی ناوچەكانی ئێرانی گرتەوە :( حسن پیرنیا :سەرچاوەی پێشوو، لا٢١٧) .

١٣٠. عەتا قەرەداخی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٤٨.

١٣١. هەمان سەرچاوە، لا ٦١.

١٣٢. مطاع الصفدی : استراتيجيه التسميه، دار البيان، بغداد ١٩٨٦، لا ٢٧١.

١٣٣.عەتا قەرەداخی: سەرچاوەی پێشوو، لا٧٤

١٣٤. بەهمەن طاهر نەریمان: گۆڤاری ژیار، ژمارە ٥، هەولێر، ٢٠٠٠، لا ١,٦.
١٣٥. هەمان سەرچاوە، لا ١,٧.
١٣٦. عبدالعزیز الدوری : سەرچاوەی پێشوو، لا ١٧.
١٣٧. هەمان سەرچاوە، لا ١٨.
١٣٨.ابن خلدون: سەرچاوەی پێشوو، ج١، لا٢٦٣.
١٣٩. الشهرستانی: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٩٥.
١٤٠. هەمان سەرچاوە، لا٢٦٩.
١٤١. تقی الدباغ: الفکر الدینی القدیم فی الاسلام، ط١، بغداد، ١٩٩٢، لا١٥٤.
١٤٢.وەرگیراوە لە ابوریان: تاریخ الفکر الفلسفی فی الالسلام، ت١، بیروت، ١٩٨٦، لا١٥٤.
١٤٣. محمد عبدالله عوده واخرون مختصر التاریخ الاسلامی، لا٧٧.
١٤٤. احمد امین: فجر الاسلام، لا١,٩.
١٤٥. الشهرستانی :سەرچاوەی پێشوو، لا٢٩٧.
١٤٦. وەرگیراوە لە احمد امین: سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٠.
١٤٧.عبدالعزیز الدوری: مقدمه تاریخ صدر الاسلام، ت١، بغداد، لا٧٥.
١٤٨. عبدالماجود احمد سلمان: سەرچاوەی پێشو، لا١٧٩.
١٤٩. محمد جاسم حمادی : سەرچاوەی پێشوو، لا٤٥٨.
١٥٠. یاقوت الحموی: سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ٣٧٥.
١٥١. احمد میرزا: سەرچاوەی پێشوو، لا١١٤.
١٥٢. عبدالماجود احمد سلمان: سەرچاوەی پێشو، لا١٧٩.
١٥٣. زرار صدیق زرار: سەرچاوەی پێشوو، لا ٩٣.
١٥٤. هەمان سەرچاوە، لا٩٣.
١٥٥. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٥، لا ١٦٥.
١٥٦. وەرگیراوە لە فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١١٠.
١٥٧. هەمان سەرچاوە، لا ١١٠.
١٥٨. هەمان سەرچاوە، لا ١١٠.
١٥٩. ابن الاپیر: ج٨، لا ١,٢.
١٦٠. فائزە محمد عزت، سەرچاوەی پێشوو، لا١٢١.

## بەشی سیٚ یەم

# ڕۆڵی کورد لە ڕاپەڕینەکانی خەواریجدا

## باسی یەکەم:

# کورد لە نێوان لایەنگیری خەلافەت و بزووتنەوەکانی خەواریج دا

پرۆسەی فتوحات لە کوردستاندا بەناو جەنگو ئاشتیدا تێپەڕی، ئەو هەرێمانەی کە بە خواستی خۆیان پێشوازییان لە عەرەبە موسڵمانەکان کرد، بڕیاری دانیشتوانەکەی نەبوو، هەروەك چۆن بڕیاری جەنگیش خواستی خەڵکی کورد نەبوو، هەرچی بڕیاری جەنگو ئاشتی بوو لە دەستی سوپای ساسانیەکان بوو، لەبەرئەوە نەجەنگکردن لەگەڵ سوپای ئیسلامدا بۆ ئێستای کورد نەنگییە، نە بەئاشتی قەبوڵ کردنیشی مایەی شانازی ئێستای کوردانە، هەر ڕووبەڕوو بوونەوەیەك لەگەڵ سوپای عەرەبە ئیسلامیەکاندا ئەگەر کوردانیش لایەنگرییان کردبێت، ئەوە مانای بێزاربوونیان بووە لە دەسەڵاتی سیاسیو دیسپۆتیزمی ساسانیە فارسەکان، لە بەرئەوە پشگیریو دانەدواوەی ئیسلام لەلایەن کوردانەوە مانای ڕازیبوونو ڕازینەبوونیان بووە بە دەسەڵاتی ساسانیەکان، چونکە لە دەسپێکی سەرەتادا ئیسلام وەك دەسەڵاتێکی سیاسی تەماشاکراوە نەك وەك ئاینێك تاوەکو بایەخی بزانن، بایەخزانینی ئایینی ئیسلام بۆ کوردان دوای قۆناغێك مانەوەی بووە لەناو کوردا، واتە کورد ئەگەر پێشوازیشی لەسوپای ئیسلام کردبێت پێشوازی نەبووە لەکلتووری ئیسلامو عەرەب، هەربۆیە ئەو پێشوازییە لەلای کوردان مانای لەیادکردنی کلتوورو ئایینو دابو نەریتی خۆی نەبووە، بەڵکو مانای لەیادکردنی دەسەڵاتی سیاسی ساسانیەکانو داگیرکەری ئەوکاتەی بووە، لەبەرئەوە

کاتێکیش ئومەویەکانو دەسەڵاتی خەلافەت کاری لەسەر لەیادکرنی لایەنی کلتووریو فەرهەنگی کورد کردبێت، ئەوا ڕاستەوخۆ کورد پشگیری هەر هێزێکی نەیاریان کردووە دژی ئەو خواستە، لەبەرئەوە ئیسلام لە دەروونو جڤاتی کوردی دا هەرگیز وەك پرۆسەیەك نەسەپاوە، بەڵکو ئەوە لۆژیكو خواستی ئازادانەی کورد خۆی بووە، هێدی هێدی ئەم ئایینەی قەبوڵکردووە، لە دوای دەرکەوتنی ئیسلامو دەستپێکردنی پرۆسەی فتوحات، ئیتر قۆناغێکی نویٚ لە مێژووی کورد دەستی پێکرد، قۆناغێك کە لەهاتنی عەرەبە موسڵمانەکانەوە دەستی پێکردو کوردستان و ڕۆژهەلاتی کردە بەشێك لە دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامیی[1]. هەرچەندە کوردەکان لەبەردەم لێشاوی سەربازانو بانگەوازی ئیسلامی دا بۆ ناوچەکانیان تارادەیەك بەرگرییان لە بیروباوەڕی زەردەشتیو ئایینی خۆیان دەکرد، بەلاّم لەگەڵ هەستکردن بە دادپەروەری ئیسلام، ئیتر ئاشنا بوون بە بنەماو ئەرکەکانیو تێگەیشتن لە زمانی قورئانو دواجار ئەو ئایینەیان وەرگرت[2]، لێرەوە هەرێمە کوردیەکان بوون بە بەشێك لە خەلافەتی ئیسلام، بە جۆرێك لە سەردەمی خەلیفە عوسمانی کوڕی عەفاندا کوردەکان دەبنە سەرباز لە سوپای ئیسلامیداو دەورێکی بەرچاویش لە بلاّوکردنەوەی ئایینەکەدا دەگێڕن، تەنانەت لە ڕیزی پێشەوەی سوپادا دەبن بۆکشان بەرەو ناوچە شاخاویەکان. بۆ نموونە کاتێك خەلیفە عوسمان داوا لە کارگێڕەکەی خۆی دەکات لە ناوچەکانی شامو هەرێمی جەزیرەدا کە ئەوکات موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان بوو، تا حەبیبی کوڕی مەسلەمە وەك سەر لەشکرێك بنێرێت بۆ ئەرمینیا بۆ بلاّوکردنەوەی ئیسلام، بەو بڕیارەی خەلیفە والی نزیکەی هەشت هەزار جەنگاوەر لە ئەهلی جەزیرە ئامادە دەکات بۆ ئەو مەبەستە[3].

دیارە لە سەرەتادا هەڵوێستی کوردەکان لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو کە سوپای ئیسلام خۆیان لە تایبەتمەندیو شێوازی ژیانی ئەوان هەڵنەدەقورتاندو هیچ هەوڵێکیشیان بۆ ئارام گرتنو جێگیربوون لە سەرزەمینی ئەوان نەدەدا، بەڵکو بە هەڵبەندەکەیاندا تیٚ دەپەڕینو تەنها مەبەستیان گەیاندنی ئیسلام

بوو، وێڕای ئەوەش دادپەروەری ئیسلامو پەیامەکەی دەستی لە ژیانی هیچ نەتەوەیەك وەرنەدەداو یاساکانیش بوارێکیان بۆ بەرهەڵستکاری نەهێشتبوویەوە٤. کوردەکانیش پاش وەرگرتنی ئایینەکەیان مەبەستیان نەبوو هێرش بکەنە سەر ئیمپراتۆریەتی تازە دامەزراوی ئیسلام، هەربۆیە دەسەلأتداران و خەلیفەش دەستیان وەرنەدەدایە سەربەخۆیی و شکۆمەندی خێڵەکییان، تەنانەت زۆرێك لە سەرەك خێڵە کوردەکان دەسەلأتیان بەسەر تەواوی شوێنێکی وەك ئازەربایجاندا دەڕۆیشت٥. بەلأم ڕووداوەکانی دەوڵەتی خەلافەت و گۆڕانکارییەکانی لە ڕووی هەڵسوکەوت لەگەڵ گەلانی ژێر دەستی خەلأفەتدا، هەڵوێستی کوردەکانی بردە قۆناغێکی ترەوە، کە لە سەردەمی ئومەوییەکاندا بە پێی فشارەکانی سەریان، توانییان کاردانەوەی خۆیان هەبێت، هەربۆیە بە شێوەیەکی گشتی کورد لەو قۆناغە مێژووییەدا هەڵوێستی دوو لایەنانەی گرتەبەر، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ شوێنی ستراتیژی ناوچە کوردیەکان، ئەو ناوچانەی بەردەوام شانۆی ڕووداوە گرنگەکان بوون، کوردەکانیش لەو ڕووداوانەدا جارێك ئارەزوویان بۆ پشتگیری ئومەویەکان و جارێکیش لە بەرەی دژیاندا بوون٦، سەرەڕای ئەوەی کورد بەشدارییەکی بەرچاوی لە دژایەتی و بەرهەڵستکاری ئومەویەکان* هەبووە.

لە هەمان کاتیشدا زۆرجار پەیوەندیەکی باشیشیان لەگەڵ خەلیفەکانی ئومەویدا هەبووەو بەرگرییان کردووە لە دەوڵەت لە دژی هەردەست تێوەردانێکی دەرەکی. بۆ نموونە کوردەکان خەلافەتیان پاراست گێرە شێوێنی و پەلامارەکانی هۆزی (الخزر)*، ئەوانەی زۆرجار هێرشەکانیان دەگەیشتە سنووری شاری موسڵ و دەوروبەری٧.

هەروەها ( الوهرانی)* وێنەیەك لە پەیوەندییەکانی کوردو بنەماڵەی ئومەوی بە تایبەتی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ موعاویەو یەزیدی کوڕی بۆ پیشاندەداتو دەڵێ :" کوردەکان کاتێك سلاویان دەکرد لە یەزیدی کوڕی موعاویە* دەیان ووت: سلأوت لێ بێت ئەی پێشەوای دادپەروەری، سلأوت لێ بێت، ئەی جێنشینی خوا لەسەر زەوی، ئەی کوڕی مامی پێغەمبەر ( د.خ)، سلأوت لێ

بێت ئەی ئەمیری بڕواداران، میهری خودا بڕژێت بەسەرتا، سودی خودامان پێبگات بە گوێڕایەڵی کردنت، داواکارین پلەی بە هەشتت بەرز بێت، هەروەك چۆن لە دونیادا بەرزە"[8].

هەروەها سەرچاوەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کوردەکان لایەنگیری خەلیفەی ئومەوی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوون[9]، لەلایەکی تریشەوە ( ابن قتیبە) دەڵێ :" لایەنگرانی مەروانی کوڕی موحەمەد زۆرینەیان لە ناعەرەبەکان بوون[10]، بەمەش لایەنگیریکردنی کوردەکان بۆی، دژایەتیکردنی خەواریجەکانی بۆ دەوڵەت ئاسان کردبوو[11]. لایەنێکی تر لە هاریکاریکردنی کورد بۆ دەوڵەت موحەمەد ئەمین زەکی بەگ هێناویەتی‌و دەڵێت:" لەساڵی ( ١٢٩ك/٧٤٧ز) کوردەکان بەرامبەر سولەیمانی خاریجی کە لە کوردستان عصیانی کردبوو یارمەتی ئۆردوی خەلیفە مەروانی دووەمیاندا"[12].

دیارە ئەمەش دەرئەنجامی ئەوە بووە کە دەسەڵاتی ئومەوی‌و نفوسیان لە ناوچەکەدا کاریگەری زۆری لە سەر ناوچەکە هەبووە بۆ ئەوەی کوردەکان پابەندی دەسەڵاتەکەیان بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵگەڕانەوەی بەردەوامی کوردەکان ڕوویەکی شروشتیی ئەو قۆناغە بووەو بەردەوام هۆکارە سیاسی‌و ئابوورییەکان زەمینەی ئەو دۆخەیان ڕەخساندووە، بەتایبەتی کاتێك ئومەویەکان لاوازببوون[13]. بۆ نموونە کوردەکان لە قۆناغێکدا ناوچەکانی جەزیرەو شارەزووریان کردبووە بنکەیەك بۆ خەواریجە هەڵهاتووەکان[14].

بەمجۆرە بەدرێژایی سەردەمی ئومەوی کورد هەڵوێستێکی یەك لایەنانەیان نەبوو لەمەڕ دەوڵەت‌و بەردەوام زەمینەو هۆکارەکان هەڵوێستەکانیان دەگۆڕی. بۆ کۆتایهێنان بە ئومەویەکانیش ڕاستە کورد بەشدارییەکی بەرچاوی لە سەرکەوتنی شۆڕشیی عەباسییەکاندا گێڕا، بەڵام دەرگاشیان ئاوەڵابوو لەبەردەم بنەماڵەو خانەدانی ئومەویە هەڵهاتووەکان بۆ ناوچەکانیان، ئەم پشگیرییەی ئومەویەکان‌و سەردارەکانی ئەو بنەماڵەیە تەنها لەلایەن دەرەبەگ‌و چەند سەردارێکی کوردەوە بوو، ئەوانەی وەك مورتەزەقەو جاشێك بۆ بنەماڵەی ئومەوی ژیانیان تەرخانکردو لەدواساتەکانی تەمەنیشیاندا هەر

وەك خزمەتكاریان مانەوەو بوونە قەڵغانیان، ئەگەر نا چین و توێژەكانی كوردەواریو خەڵك بەگشتی لە دەسەلاتی ستەمكارانەی ئومەویەكان پڕ بوو بوون، ئەمە ئەو كاتە بوو كە كۆتایی بەحوكمی ئومەویەكان هات لە دیمەشقدا. بۆ نموونە هەندێك لە هۆزە كوردیەكان پێوەنییەكی تۆكمەیان لەگەڵ بنەماڵەی ئومەویەكان هەبووە، بەجۆرێك تا كۆتایی دەسەلاتیان خزمەتی ئومەویەكانیان كردووە و دواتریش پارێزگارییان كردوون لە كاتی هەڵهاتنیان بۆ ناوچەكانی هەكاری* و جۆلەمێرگی* كوردی١٥، كە ناوچەیەكی ئارام بوون بۆ خۆحەشاردانی پاشماوەی ئومەویەكان، ئەم دوا لێزمەیە لە پێوەندیی كوردو خەواریج لەلایەك و كوردو ئومەوی لەلایەكی ترەوە، زۆر بەڕوونی لە ماوەی فەرمانڕەوایی حەجاجی كوڕی یوسفی سەقەفیدا كە بەدرێژایی بیست ساڵ هەموو بزوتنەوەیەكی خەواریجی لە ئێران و عێراق سەركوتكرد دەردەكەوێت١٦

هەرچەندە حەجاج لەو ماوەیەدا سیاسەتی نەژادی بنەماڵەی ئومەوییەی لە بەرامبەر ناعەرەبەكاندا جێبەجێ دەكردوو كاردانەوەیەكی توندی لە ڕووی دەوڵەتدا هێنایە گۆڕێ١٧، بەلام دەبینین هەندێ كات كوردەكان لە بەرامبەر هەموو سیاسەتە نەژادیو ستەمكارییەكانی حەجاجدا دەبوونە لایەنگریی. پێدەچێت هۆكاری ئەوە بگەڕێتەوە بۆ سیاسەتی بە زۆرە ملێ كردنی سەربازی لە ناو نا عەرەبەكاندا١٨. لەو قۆناغەدا ( سوید بن عبدالرحمن السعدی) دەكرێتە والی حولوان* و ماسبزان*، كە دەكاتە ساڵی (٧٧ك/ ٦٨٦ن)، لە هەمان ساڵ دا بەشێكی چەكداری خەواریج بە سەرۆكایەتی موترەفی كوڕی موغەیرەی كوڕی شوعبە * پەیدا دەبن، سوید بە كۆمەكی كوردی دانیشتوی ناوچەكە بەرەنگاری موترەف دەبێتەوەو داوای لێدەكات لە پێشڕەوی بوەستێ و داوای بەخشین لە حەجاج بكات١٩. بەلام موترەف لە ڕاست و چەپی لای كۆتایی شاخی حولوانەوە پەلاماری كوردەكان دەدات و بەرەو هەمەدان* پێشڕەوی دەكات، حەجاجیش لە شكرێكی شەش هەزار جەنگاوەری كورد لەگەڵ خۆیدا بۆ شەڕی موترەف دەنێرێت٢٠.

ئەوە نموونەیەك بوو لە پشتگیری كورد بۆ دەسەلاتی ئومەوی لە دژی خەواریج، بەلام زۆرجار ئەم شێوازە لەگەل چەندین هۆكاری كلتووری‌و سیاسی‌و ئابووری پێچەوانە دەبێتەوەو هاوكاری كودو خەواریج نەخشێكی دیاری ئەو مێژووە دیاری دەكەن

# باسی دووەم:

## کوردو بزووتنەوەکانی خەواریج لە کۆتای سەردەمی ڕاشیدین
## ( ٣٨-٤٠ك/ ٦٦٢-٧٧٠ز)

### یەکەم: کوردەکانی ئەهوازو ڕاپەڕینی خەریتی کوڕی ڕاشید

ئەم بزووتنەوەیە لە دەورووبەری ئەهوازو هەرێمی فارسداو لە سەردەمی خەلیفە عەلی کوڕی ئەبو تالیبدا لە ساڵی ( ٣٨ك-٦٦٠ز) ڕوویدا.
لە ڕاپەڕینەکەدا دژی دەوڵەتی خەلافەت کوردەکان بەشدارییەکی بەرچاویان لە ڕووبەڕوو بوونەوەکاندا هەبوو٢١. ڕابەرایەتی ئەم بزووتنەوەیە لەلایەن خەریتی کوڕی ڕاشیدەوە *، کە سەرکردەی هۆزی ناجیە بوو دەبرا بەڕێوە. هەر لە سەرەتاوە خەریت دژی کوشتاری خەواریجەکان بوو لە نەهرەوان، ئەوەبوو لە کاتێکدا عەلی کوڕی ئەبو تالیب کوشتاری ئەهلی نەهرەوانی دەکرد، ئەو لەگەڵ (٣٠٠) جەنگاوەری شوێنکەوتووی یاخی دەبێتو لە شاری کوفەدا ڕیزەکانی خۆی ڕێکدەخات، پاشان دەچێتە لای عەلیو پێی ڕادەگەیەنێت، ئیدی وەك ئەمیری بڕواداران دانی پیادا نانێتو دەڵێت: " سوێند بەخودا گوێ ڕایەڵی فەرمانت نابمو لە پشتتەوە نوێژ ناکەم و لێت جیا دەبمەوە، لە بەرئەوەی بە پێچەوانەی فەرمانی خودا تەحکیمتکرد" ٢٢.
ئیتر خەریت یاخی دەبێت و دەردەچێتو کوفە بەجێدەهێڵێت.

بەمجۆرە خەریتو شوێنکەوتووەکانی بە هەرشوێنێك بگەیشتنایە دەستیان بەسەردا دەگرتو تالآنییان دەکرد، لە سەرەتادا گەیشتە ( سیف عمان) و لەوێدا ( حلو بن عوف ازدی) کە کاربەدەستی عەلی بوو بەدەستی خەریتو سەربازانی دەکوژرێت، خەریت لە درێژەی یاخیبوونەکانیدا تەنانەت بڕیاری هەڵگەڕانەوەی لە ئایینی ئیسلامدا، لە بەرامبەریشدا عەلی هەستی بە مەترسی ئەم بزووتنەوەیە کردو داوای لەکار بە دەستەکەی خۆی کرد، کە ناوی ( زیاد بن ابیە)* بوو لە هەرێمی فارس تا هەوڵی سەرکوتکردنی بزووتنەوەکەی خەریتو لایەنگرانی بدات، بەلآم زیادیش کەوتبووە ژێر کارگەری خواستەکانی خەریتەوەو لە خەلیفە عەلی هەڵگەڕایەوە، دوواجار خەلیفە خۆی بڕیاری ڕووبەڕوو بوونەوەی هەردوو لایدا. ئەوە بوو لە جەنگێکدا زیاد بریندار دەبێتو خەریتیش بەرەو ئەهواز هەڵدێت، بەلآم عەلی واز ناهێنێت و (٤٠٠) جەنگاوەر بە سەرکردایەتی ( معقل بن قیس ریاحی) دەنێرێت بۆ کۆتایی پێهێنانیان٢٣. تا ئەکاتە خەریت لە هەرێمەکەدا دەتوانێت جۆرەها گروپی جیاوازی ئیتنیو مەزهەبیی لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە وەك کوردو عەرەبو مەسیحی، ئەمانە دەیانویست باجو خەراج نەدەنو ناڕازیبوون بە سنوورەکانی دەسەلآتی خەلافەت لە بواری باجو سەرانەو ئابووریدا، زۆرێکیشیان مەبەستیان لەو نا ئارامییەی ئەو سەردەمە، دەستکەوتی دزیو تالآنیو فەرهودی ماڵو سامانی دەوڵەتو خەڵکی دەوڵەمەند بوو، دیسانەوە کارگێڕەکەی عەلی لە هەرێمی فارسیشدا کە ناوی ( سهل بن صنیف) بوو، پاڵپشتی بزووتنەوەکەی خەریتی کردو دژی دەوڵەت یاخی بوو، دواجار لەشکری خەلیفەو خەواریجەکان لە نێوان هەردوو لایاندا جەنگ لە نزیك چیای ( رامهرمز)*دا دەستپێکرد٢٤، لە جەنگەکەدا ( معقل بن قیس)ی سەر لەشکری خەلیفە پێیان دەڵێت:" لەگەڵتان دەجەنگم لە پێناو ئەوەی کەسانێك دەکوژین کە لەئایین دەرچوونو خەراج* نادەنو دزو علوجو کوردن"٢٥ کە واتە پاساوی خەلافەت لەم بانگەشەیەی خەلافەتدا دزیو لەدین دەرچوونو کورد بوون بووە، کەواتە هەرسێ هۆکارەکانی ئایینیو

نەتــەوەیی‌و ئـابووری لــە ململانێکانــدا ئامادەیــان هــەبووە، دەکرێــت دیــسان بپرسین، ئەو نەتەوە جیاوازانە چ هێزێك وایکرد لەدژی خەلافەت یەك بگـرن ؟، ئەی چ هێزێك وایکرد دژی بکـەن؟، یـاخود بۆچـی باوەڕپێکراوەکـانی دەولّـەت لــەدژی خەلافــەت‌و دەولّەتەکــەیان کــە ئــەوکات ســەردەمی عــەلی بــووە هەلگەڕاونەتەوە؟، چی وایکرد پیاوانی دەولّەتی عەلی، کە بنەماڵەی پێغەمبەرو یەکێك لـە کۆلّەکـەکانی ئیـسلام‌و موژدەدەرەکـانی بەهەشـتە، دژی بوەسـتن؟ یاخۆ مانای ئەو بانگەشـەیەی مەعقـەلی کـوڕی قـەیس لـە چیدایە کـە هـاواری دەکـرد دژی کـوردو علوجـەکانن؟ ئایـا ئـەم بانگەشـەیە دەمـارگیری پیـاوانی دەولّــەتبووە دژی کــورد، ئایــا هــەر ئــەم هۆکــارەش بــوو وایکــرد کــوردو مەسـیحیەکان لــەدەوری بانگەشـە یەکـسانی خوازەکـەی خــەریتی ڕاشــید کۆببنــەوە ؟ هەرچــۆنێك بێــت لــەکۆتایی جەنگەکــەدا (٣٠٠) جــەنگاوەر لــە تالاّنچی‌و ( العلوج )و کوردەکان کوژران٢٦ و مەعقەلی کوڕی قەیسی نێـردراوی خەلیفــە زالّ بــوو بەســەریانداو٢٧ زۆر بەتونـدیی‌و بــەپێی نەخــشەو پلانــی دەسەلاّتی ناوەند بزووتنەوەکەی سەرکوتکرد٢٨.

## دووەم: کورد لە بزووتنەوەکانی

## (هیلال بن علفە، ابی مریم، سعد بن قفل)دا

پاش جەنگی نەهرەوان بـە شـێوەیەکی ڕاسـتەوخۆ جوولاّنـەوەکانی خـەواریج بلاّوبوونـەوە، ئەمـەش بـە هـۆی هـەموو ئەوانـەوە بـوو کـە لـە جەنگەکـەدا ڕزگاریـان بـوو٢٩، لەلایـەکی تـرەوە بـە هـۆی ململانێکـانی نێـوان عـەلی‌و موعاویــەوە زەمینــەی چـالاکیەکانیان بـۆ ڕەخـساوتر بـوو٣٠، بـەلاّم ئـەم جوولاّنەوەیەو زۆرینەی هەستانەوەکانیشیان وەك پاساوێك‌و کاردانەوەیـەك بـۆ ئەو تراژیدیایە بوو کە لە جەنگی نەهرەواندا بە سەریاندا هـات، لـە دیـارترینی

ئەو جوولانەوانەش، بزووتنەوەکەی ( هیلال بن علفە ) بوو کە ڕاستەوخۆ دوای جەنگی نەهرەوان ڕووی کردە شاری ( ماسبزان) کە دەکەوێتە باشووری هەرێمی چیاکان، هیلالو براکەی ( مجالد) و زیاد لە دوو سەد کەس لە شوێن کەوتوانیان توانیان ڕووبکەنە ناوچەی ( ماسبزان)و لەوێدا جێگیربن٣١، ئەم جوولانەوەو یاخی بوونەی هیلال هەر لە سەرەتاوە لاواز بوو، ئەوەش بەهۆی ئەو شڵەژانو پەرتەوازە بوونەوە بوو، کە خەواریج لە دوای جەنگی نەهرەوانەوە توشی هاتبوون، چونکە تەواوی سەرکردە سیاسیەکانیان لە دەستدابوو، ئیتر بە لەناوچوونیان بۆشاییەکی گەورەیان بەجێهێشت بەمەش سەرکردەیەکی شیاو و کارێزمی نەبوو تا خەواریجەکان لە پەرتەوازەییەوە یەك خاتەوە، لەلایەکی ترەوە زۆرێکیشیان دوو دڵبوون لە جەنگان لەگەڵ خەلیفەو خەلافەتدا٣٢. لەگەڵ ئەوەشدا هیلال بزووتنەوەکەی بەنێوی خەواریجەوە دەستپێکردەوە، ئەو خەڵکی بانگدەکرد بۆجەنگان دژی عەلیو لە ناوچە کوردیەکاندا هەوڵی بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکەی دەداو بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێبازەکەی خۆی٣٣، بەمەش زۆرێك لەخەڵکی بە گوێیان کردوو تەنانەت بوو بە هۆکاری کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی شارەزووریش لە دەوری بزووتنەوەکەی ( ابی مریم )، کە لە هەمان کاتداو لە شارەزووردا سەریهەڵدا بوو٣٤. بەلام بزووتنەوەکەی هیلال سەرکەوتنی بۆ نەنوسراو بەردەوام نەبوو، لە بەرئەوەی مەعقەلی کوری قەیس لەلایەن خەلیفە عەلی نێردرا بۆ کوشتاریانو توانی زاڵبێت بەسەریاندا٣٥.

لەگەڵ ئەوەی بانگەوازەکەی هیلال زۆرێك لە خەڵکی هێنا بوویە ڕیزەکانی خەواریجەوە، بۆ نموونە سەرکردەیەکی دیاری وەك ( اشهبی قرنی) لە نێو ڕیزەکانیاندا بوو، ئەم کەسایەتییە قورساییەکی گەورەی لەناو ڕیزەکانی خەواریجدا هەبوو، تەواوی خەواریجەکانی جەزیرە خۆشیان دەویست٣٦، بەلام بزووتنەوەکە لەگەڵ یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی لەگەڵ سوپای عەلیدا لە نێو دەچێت، دیارە هۆکاری ئەمەش پەلەکردنی خەواریجەکان بوو لەڕوو بەڕووبونەوەیان لەگەڵ خەلیفەدا پاش ئەوەی خۆیان بەتەواوی ڕێکنەدەخست.

هۆكاری ئەمەش ئەوە بوو خەواریجەكان باروودۆخی خەلافەتیان بەهەلدەزانی بۆ دەست وەشاندن، چونكە ئەوكات لە ڕەوشێكی زۆر ناسكدا بوو بە هۆی ململانێ ناوخۆیەكانیانەوە، بەلاّم خەواریجەكان نەیاندەزانی ناتوانن ڕووبەڕووی ڕەوشی ناسكی خەلافەتیش ببنەوە، لە بەرئەوە ڕووبەڕووبوونەوەی خەلافەت زیاتر هۆكاری سۆزو حەماسەتێكی كاتی بوو نەك پاڵنەرێكی لۆژیكیو وردبین، ئەوەی گرنگ بێت ئەوەیە ئەم بزووتنەوەیە كاریگەری لە دوای خۆی بەجێ هێشت، ئەوە بوو درێژەی هەوڵەكانیان لە شارەزووردا لە ناو بزووتنەوەیەكی بە گورتردا لەلایەن ( ابی مریم ) وە سەریهەڵدا.

ئەم بزووتنەوەیە زۆرینەی شوێنكەوتوانیان ناعەرەب بوون، تەنانەت دەوترێت:" هیچ عەرەبێكیان لە گەڵدا نەبوو جگە لە شەش كەس كە ( ابی مریم ) یە كێك بوو لەو شەش كەسە"٣٧.

پاش ئەوە بزووتنەوەكە لە شارەزووردا خۆی ڕێكخست ئیدی گوازرایەوە بۆ شوێنەكانی نزیك بە دەوڵەتی خەلافەت٣٨.

بە مجۆرە ( ابی مریم السعدی ) لە شارەزوورەوە گوازرایەوە بۆ مەدائین*، چونكە مەدائین بە دەرگای كوفە دادەنرا ٣٩. لە هەمان كاتیشدا ( سعد بن قفل) لە( بندنجین)*ەوە وەك بزووتنەوەیەكی تری خەواریج سەریهەڵداو ئەویش ڕوویكردە مەدائین٤٠. دیارە ئەم گواستنەوانە هۆكارێك بوون بۆ گواستنەوەی بیری خەواریج، بە تایبەتی دوای ئەوەی لە شارەزوورو بندنجینەوە خۆیان ڕێكخستو ئامادەی وەستان بوون لەبەردەم خەلافەتدا، ئەوەبوو ( ابی مریم السعدی ) لە شارەزوورەوە خەڵكی هاندەدا بۆ شەڕكردن بەرەو دەوڵەتی خەلافەت، بەمەش خەڵكێكی زۆر بەگوێیان كردوو پاشان لە گەڵیشیان بەڕێ كەوتن بەرەو كوفە.

ئۆردووی خەواریج تاوەكو ( ٢.كم) لە نزیك كوفە نزیكبوونەوە، لەم كاتەدا پێشەوا عەلی داوای كرد بۆ ئاشتبوونەوەو هاتنەوەیان بۆ كوفەو ڕیزەكانی دەوڵەتی خەلافەت، بەلاّم ( ابی مریم السعدی ) ڕازی نەبوو، لەوەلاّمدا ڕایگەیاند: " ئێمە هیچ لە نێوانماندا نیە جگە لە جەنگو شمشێر "

لەئاکامدا شەریحی کوڕی هانی لەلایەن پێشەوا عەلی نێردرا تا بزووتنەوەکە لەنێو بدات، لەشکری شەریح (٧٠٠) جەنگاوەر دەبوون، لەبەرامبەریشدا خەواریجەکان لەنێو خێوەتەکانیاندا خۆیان ڕێکخستو ئامادەی جەنگ بوون، بەمجۆرە لە پێکدا دانێکدا ( ابی مریم السعدی ) تێك دەشکێتو بزووتنەوکەی لەنێو دەچێت٤١. بەڵام لە گێڕانەوەیەکی تردا دەوترێت ( ابی مریم السعدی ) دەردەچێت بۆ ناوچەی فوراتو لەوێدا عەلی کوڕی یەحیای کوڕی هانی لەلایەن خەلیفەوە دەنێردرێت بۆیان تا لەنێویان بدات، هەر ئەویش لە ئاکامدا لەنێویان دەباتو سەرکردەکەیان دەکوژێت٤٢.

سەبارەت بەڕۆڵی کوردەکانی شارەزوور لەم بزووتنەوەیەدا دەردەکەوێت کە بە شێوازێکی ئازایانە ڕووبە ڕووی نەیارەکانیان بوونەتەوە ( ابن الاثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت:" ئازاترین جەنگاوەر بوون لە ڕیزەکانی خەواریج"٤٣. پێمان وایە سیفەتی ئازایەتی دەرخەری ئەو ڕاستیەیە کە کوردەکان هێزی مرۆیی بزووتنەوەکە بوون، بەمجۆرە بزووتنەوەکەی ( ابی مریم) وەك ترسناکترین جووڵانەوە، کە لەدوای نەهرەوان سەریهەڵدایەوە سەرکوتکراو ساڵی ( ٣٩ك/ ٦٥٩ز)کۆتایی پێهات٤٤.

ئەوەی گرنگ بێت کاریگەریەکانی ئەم بزووتنەوانە بوو لە هەرێمەکاندا، بەردەوام لە هەرێمە کوردیەکاندا جووڵانەوەکان زیندوو بوون، بۆ نموونە لە درێژەی جووڵانەوەکاندا کەسێك بە ناوی ( ابو لیلی)* جوڵانەوەیەکی دەست پێکرد، بەشداربووانی جووڵانەوەکەی تەنها (٣٠) جەنگاوەر دەبوون، کە زۆرینەیان نا عەرەب بوون٤٥. ئەم جووڵانەوەیەش بەچارەنووسی ئەوان برا، بەڵام بیری خەواریجو هۆشیاری سیاسی خەڵکی ناوچەکە، بەتایبەت هەرێمە کوردیەکان بوو بە نەریتێك کە بۆ یەکەمجار خەواریجەکان هێنایانە هەرێمە کوردیەکانەوە، ئەوان بۆ یەکەم جار ڕێگای یاخی بوونیان دژی دەسەڵاتی ناوەند پیشانی کوردەکاندا، ئەم نەزمەش بەدرێژایی سەردەمەکان کاری لەسەرکرا، بەمجۆرە بەردەوام دەنگێکی ناڕەزایی لە هەرێمە کوردیەکاندا پشتیوانی هەر هێزێکی کردووە دژی ئەو هێزە غەوارەو نامۆیەی کە خۆی

کرده کولتووری ئایین‌و سیاسه‌تیان، ته‌نها کاتێك ئه‌م ده‌نگانه‌ نزم‌و سره‌واون، که‌ فه‌رهه‌نگ‌و کلتوری عه‌ره‌بی، که‌ هێزی دنیاگه‌رایی والی‌و کارگێڕه‌کان له‌ به‌رامبه‌ر په‌یامی ئیسلام‌و فاکته‌ری هاتنیاندا نزم‌و که‌مبوو بێت، له‌ به‌رامبه‌ریشدا ده‌وڵه‌تی خه‌لافه‌ت هه‌وڵی سه‌قامگیرکردنی دۆخه‌که‌و سه‌پاندنی سه‌نته‌ری داوه‌، ئه‌وه‌ بوو پاش سه‌رکووتکردنی جووڵانه‌وه‌کان، خه‌لیفه‌ عه‌لی له‌ ناوچه‌کانی هه‌رێمی جه‌زیره‌دا مالیکی کوڕی ئه‌شته‌ر وه‌ك والی‌و کارگێڕی به‌توانای ده‌وڵه‌ت ده‌ستنیشانده‌کات، به‌ تایبه‌تی بۆشاره‌کانی ( موصل، نصیبین، دارا*، سنجار، امد، میافارقین)٤٦

# باسی سێهەم:

# کوردو ڕاپەڕینەکانی خەواریج لەسەردەمی بەهێزیی ئومەویەکان دا

## یەکەم :کوردو بزووتنەوەی فەروەی کوڕی نەوفەلی ئەشجەعی

پاش ئەوەی خەلیفە عەلی بەڵێنیدا بە خەواریجەکان لێیان خۆش بێت، لێرەوە ئەو بانگەوازە درزیخستە ڕیزەکانی خەواریجەوە، بە جۆرێک هەندێکیان چوونەوە نێو ڕیزەکانی خەلافەتەوەو بەشێکیشیان چوونەوە کوفە، بەڵام پاشماوەکانیان بەزۆری لە ژێر فەرماندەیی فەروەی کوڕی نەوفەلی ئەشجەعیدا خۆیان ئامادەی یاخی بوون کردوو بەرەو شارەزووری دوور لە دەسەڵاتی خەلافەت بەڕێکەوتن. گروپەکەی فروە لە شارەزوور خۆیان توندکرد٤٧. لەوێ مانەوە تا وەکو گرتنە دەستی دەستەڵاتی ئومەویەکان، ئەم گۆڕانە لە سیستەمی حوکمڕانی ئیسلامیدا لەلای خەواریجەکان جێگای نەفرینو تورەیی بوو، خەواریجەکان بە ئاشتی ناچاریی نێوان حەسەنی کوڕی عەلیو موعاویە ڕازی نەبوون. هەربۆیە لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵاتی خەلافەت لەلایەن ئومەویەکانەوە لەساڵی ( ٤١ك/٦٦١ز)، ئەوان ناڕازی بوونو کەوتنە پیلان بۆ کوشتنی موعاویە٤٨.

یەکێك لەو سەرکردانە فروە بوو، کە ئەوکات لەگەڵ (٥٠٠) جەنگاوەر لە لایەنگرانی یاخیبوو بوون‌و لە پاش شارەزوور ڕوویان کردبویە ( بند نیجین)و لەوێ جێگیربوو بوون٤٩. فروە بە زانینیی دەسەڵات گرتنە دەستی موعاویە وتی بە هاوەڵەکانی: "ناتوانم هەڵس‌و کەوت بکەم تاوەکو بەرچاو ڕوون بەبم لە جەنگی موعاویەو شوێنەکەوتوانی"٥٠.. مەبەستی دۆزینەوەی میکانیزمێك بوو بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئەو دەسەڵاتە نوێیە، یاخۆ مەبەستی بووە ئایا هەڵوێستی موعاویەش هەمان هەڵوێستی ڕاشیدینەکانە بەرامبەریان، فروە لەسەرەتادا لە مەندەلی بوو، بەڵام لەوێ هەستی بە ئارامی‌و ئاسودەیی نەدەکرد، بیریکردەوە بۆ ئەوەی ڕووەو ڕۆژهەڵات‌و بەرەو ناوچە شاخاویە سەختەکان بچێت٥١.

( الدینوری) لەم مبارەیەوە دەڵێت: " فروە لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵی بوون لە خەواریجەکان، چوونە حولوان* و لەو هەرێمەدا خەراجی ئەو ناوچەیەیان وەرگرت‌و بەسەر لایەنگرانی خۆیاندا دابەشیان کرد"٥٢، بەم مجۆرە فروە وەك سەرکردەی ڕەوتێکی خەواریج تاوەکو سالی ( ٤١ك/٦٦١ز) لە نێوان ناوچەکانی هەرێمی چیاو شارەزووردا ئەم سەرو ئەو سەری دەکردو سەرقالی خۆئامادەکردنی بواری سەربازی‌و ئابووری بوو٥٣. دوواجار وەك باسمانکرد خۆی لە شارەزوور قایم کرد، هەربۆیە لەو ماوەیەدا بەتەواوەتی بیری خەواریج لە ناوچە کوردیەکاندا بلاوبوویەوە٥٤.

لە بەرامبەریشدا موعاویە لەگەڵ گرتنە دەستی دەسەڵاتدا هەستی بە مەترسی فروە دەکرد، فروەش بەلایەنگرانی خۆی ڕاگەیاندبوو، ئیتر کاتی ئەوە هاتووەتە پێشەوە بچینەوە کوفەو شەڕ لەتەك موعاویەی ستەمکاردا بکەین، لەبەرئەوە شەڕکردنمان گومانی تیادا نەماوە٥٥.

هەربۆیە موعاویەش بۆ ئەو مەبەستە داوای لە حەسەنی کوڕی عەلی کرد هاریکاری بکات دژی فروەو خەواریج، بەڵام حەسەن لە ڕێگا دەبێت بۆ مەدینەو ئەم داوایەی موعاویە دەداتە دواوە٥٦، لە بەرامبەریشدا فروە لە شارەزوور خۆی ڕێکدەخات‌و زۆربەی کوردەکانیش لە دەوری کۆدەبنەوە بە

شێوەیەك ژمارەیان دەگاتە ( ١٥..) جەنگاوەر٥٧، لەم بارەیەوە یەعقوبی دەڵێت :"فروە بە هێزێکی ( ١٥..) کەسییەوە ڕوودەکاتە ( نخیلە) کە شوێنێکە لە نزیك کوفەیە، هێزەکانی دەوڵەتیش بە هاوکاری خەڵکی کوفە لە دژی خەواریجەکان ڕادەپەڕن و تێکیان دەشکێنن"٥٨.

ئەم تێکشکانەی خەواریج لە سەردەستی موغەیرەی کوڕی شوعبە* ئەنجام دەدرێت، ئەو توانی خەواریجەکان و کوردەکان بە هاوکاری لەگەڵ ( مقبل بن قیس) دا تێك بشکێنێت، لە ئاکامدا فروەش دیسانەوە هەڵدێت بۆ شارەزوور، بەڵام سوپای ئومەوی کۆڵنادات و دوایان دەکەوێت تاوەکو لە شارەزووردا فروە دەکوژن٥٩، بەڵام ( ابن الاپیر) دەڵێ: فروە لە ( ارض سواد) کوژرا"٦ هەروەها تەبەری لەمبارەیەوە دەڵێت: " پاش ئەوەی فروە دەچێتە شاری کوفە دوای پێکدادان لەگەڵ سوپای ئومەویدا برینـدار دەبێت و دوواتر دەکوژرێت، ئیدی کۆتایی بە بزووتنەوەکەی دێت"٦١

سەبارەت بە ڕۆڵی کوردەکان لەم بزووتنەوەیەدا ئەوا هەر لە سەرەتاوە هاریکاری ئەم هێزەیان کرد، چونکە سەرەتا فروە لەگەڵ ( ٥..) کەس چووە شارەزوورەوە، کەچی بە هێزێکی (١٥..) جەنگاوەری خۆی ڕێکدەخات بۆ جەنگی موعاویە٦٢، هەروەها بزووتنەوەکەی فروە کاریگەریشی لە ناوچە کوردیەکان بە جێهێشت، بە جۆرێك( ابن الا ثیر) دەڵێت: "لە ساڵانی ( ٣٩-٤.ك/ ٦٥٩-٦٦.ز) پەلی دیکەی خەواریج لە شارەزوورو ماسبزان پەیدا بوون"٦٣ ئەمەش ئەو گریمانەیە دەسەلمێنێت کە ناوچە کوردیەکان مەیدانی چالاکی خەواریج بوون و لە یارمەتی خەڵکی ناوچەکەش بەهرەمەند بوون٦٤، سەبارەت بە دەرەنجامەکانیش مێژوو نووسان جەنگی ( النخیلە) بە دووەم تێکشکانی خەواریجەکان دادەنێن لە دوای جەنگی نەهرەوان، چونکە کاریگەریەکی زۆری کردە سەریان و سەرکردەکەیان لە ناوچوو٦٥

بە نیسبەت کوردیشەوە ئەم ڕووداوە تاکو ئێستاش لە هەندێ بەرهەمی مێژوویی میللەتەکەمان بەرگی کوردایەتی و هەستی نەتەوەخوازی بە ڕووی دەسەلاتدارانی عەرەبدا کراوە بەبەردا، وەلێ ئەم مەسەلەیە زیاتر بیروباوەڕوو

هۆكاری ئابووری‌و سیاسی‌و كلتووری درووستی كردووه، نەك نەتەوەخوازی، چونكە فروە لەگەڵ هاو رەچەڵەكی خۆی جەنگی دەكرد كە عەرەبەو سەركردایەتی هێزێكی زۆرینەیشی دەكرد كە كوردن، لە بەرئەوە بەشداریكردنی كورد لەو بزووتنەوەیەدا هۆكاری جوگرافی‌و باوەڕو ئابووری ئاراستەی كردووە٦٦، یاخۆ كوردەكان هەستێك هانی داون كە هۆشیاری كردوونەتەوە لە ژێردەستەیی ئابووری‌و سیاسی‌و فەرهەنگییان، هەستێك كە بێداریكردوو نەتەوە بەڵێ ئەوانەی كارگێڕی هەرێمەكانیانن، ئەوانە نەبوون كە لە دەسپێكی فتوحاتەكاندا بەڵێنی پەیامێكی ئینسانی‌و ئازادیان پێدەدان

## دووەم: كوردو بزووتنەوەی ( زیاد بن فراش العجلی الخارجی )

لە ولاتی نێوان دووڕووبارداو لە ساڵی ( ٥٢ك/ ٦٧٢ن)دا ڕاپەڕینێكی بچوكی ماوە كورت ڕوویدا، ئەم ڕاپەڕینە لە ژێر سەركردایەتی ( زیاد بن فراش العجلی الخارجی )دا بوو٦٧، بزووتنەوەكەی زیاد لە سەرەتادا لە هەرێمی عێراقەوە دەستی پێكرد، بەلاَم موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەكە، یەكێك لە سەرلەشكرەكانی خۆی بەنێوی ( زیاد بن ابیە) دەنێرێت بۆ لەنێودانی، بەلاَم پێشوەخت ( زیاد بن فراش) عێراق بەجێ دەهێڵێت‌و ڕوو دەكاتە (ماە)٦٨، سەرچاوەكان ئامارەی تەواو ناكەن، كە ئایا ئەو شارە چ شارێكە، ئایا ( ماە سبزان، ماە كوفە*، ماە بصرە*) یە ، دیارە كە هەرسێكیان دەكەونە سنوری هەرێمی چیاكانەوە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت، كە زیاد بایەخی بە شارەكانی ئەو ناوچەیە نەدابێت٦٩ لەكاتی جوولانەوە سەربازییەكەیدا، بەلاَم شتێك لە سەرچارەنوسی بزووتنەوەكە لە سەرچاوە مێژووییەكاندا باس نەكراوە، پێدەچێت نەبوونی وەلاَمی خەڵكی بۆ ئەو بزووتنەوەیە، هەروەها توندوتیژی ( زیاد بن ابیە) لە سەركوتكردنی یاخی بووانـدا هۆكاری لاوازی بزووتنەوەكەی زیاد بێت، هەروەها پێمان وایە ئەم هێزە لە ئاستێكدا نەبووە وەكو بزووتنەوەكانی تر

دەنگی بەرهەڵستکاریی کوردیش یەکبخاتو بەرەیەکی فراوانتر درووست بکات، چونکە دکتۆر نایف مەعروف دەڵێت: بزووتنەوەکانی خەواریج لەو سەردەمەدا بۆ ڕوخانی دەوڵەتی ئومەوی نەبوون، بەڵکو بۆ لاوازکردنی دەوڵەت بوون:٧٠.

## سێهەم: کوردو بزووتنەوەی (حیان بن چیبان السلمی) لە حولوان

( حیان بن چیبان السلمی )* پاش ئەوەی لەجەنگی نەهرەواندا بریندار دەبێت لەگەڵ دە کەس لە هاوەڵانی بەرەو شاری ڕەی* هەڵدێت کە دەکەوێتە هەرێمی چیاکانەوە، ئیتر لەو شارەدا دەمێنێتەوە تا سەردەمی مەروانی کوڕی حەکەم، ئیتر لەو ساڵەدا کە دەکاتە ( ٥٨ك/ ٦٧٧ز)، بزووتنەوەکەی دەست پێدەکات دژی دەسەلاَتدارانی ئومەوی، لەم ساڵەدا ( حیان بن چیبان السلمی) لەگەڵ کۆمەڵێك لە خەواریجەکان کە سەرکردەیەکی وەك ( معاز بن جوینی الگائی)٧١ یان لەگەڵدایە سەرکردایەتییان دەکاتو بڕیار دەدات بچنە حولوانو لەوێدا ڕووبەڕووی دەوڵەت بوەستنەوە، بەمجۆرە دەچنە حولوان و نیشتەجێ دەبن، تا خۆیان لەڕووی سەربازیەوە ئامادە بکەن، لە بەرامبەردا ئومەویەکان هەوڵی لەنێودانیان دەدەن، تاوەکو لەدەرفەتێکدا هەردوولا ڕووبەڕووی یەکتردەبنەوە، ئەمە پاش ئەوەی خەواریجەکان بەسەرکردایەتی حەیان ڕوویانکردووەتە کوفە بۆ جەنگ، ئیتر لەو جەنگە داو لە کوفە ساڵی ( ٥٨ه/٦٧٨م) حەیان دەکوژرێت، خەواریجەکانیش بەکوژرانی سەرکردەکەیان وەك سروشتی هەموو بزووتنەوەکانیان کۆتایی بە بزووتنەوەکەیان دێت٧٢، دیارە کورتی تەمەنو مانەوەی ئەم بزووتنەوەیە بوو کە لەناوچە کورد نشینەکاندا کاریگەرییەکی ئەوتۆی لە سەر بەجێنەهێشتن.

## چوارەم   کوردەکانی هەرێمی جەزیرە  لە بزووتنەوەکانی ساڵحی کوڕی مەسرەحو شەبیبی کوڕی شەیباندا

لە سەردەمی خەلیفەی ئومەوی عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا* هەرێمی جەزیرە بوو بە گۆڕپانی چالاکیەکانی خەواریج، هەموو ئەو بزووتنەوانەش لە سەرەتاوە  لە یاخی بوونی ساڵحی کوڕی مەسرەحی تەمیمیەوە  دەستیان پێکرد  دژی دەوڵەتی ئومەوی، کە یەکەم چالاکیان  لە ساڵی (٧٦ك/٦٩٥ز) دا بوو٧٣، ئیتر  لەوکاتەوە تا وەکو سەدەی سێهەمی کۆچی بەردەوام بوونو لە سەردەستی بنەماڵەو هۆزی بەناوبانگی شەیبانی عەرەبی لەهەرێمی جەزیرەداو بەهاوکاریو هاوسەنگەری ناعەرەبە موسڵمانەکانەوە، بەتایبەت کوردەکانی ئەو دەڤەرە جولانەوەکان بەڕێوە دەچوون، ئەوانەی کە لەموسڵ و وولاتی جەزیرەدا نیشتەجێ بوون٧٤،  لە سەرەتای کاردا ساڵحی کوڕی مەسرەح هەڵگری بیروباوەڕی خەواریجە سەفەریەکان* بوو، ئەو وەکو پیاوێکی گۆشەگیرو لە خواترس خەڵکی بانگدەکرد بۆ ملنەدان بۆ ستەمو ترسان لە خواو وەرنەگرتنی ماڵی حەرامو ڕشتنی خوێنی بە ناڕەوا٧٥، هەروەها قورئانی فێردەکردنو بانگی دەکردن بۆجیهادو ئامۆژگاری دەکردن بۆ کۆچکردن لە ژێر سایەی دەسەلاتی ئومەویەکان٧٦، ئیتر یەکەمین چالاکیی ساڵحو شوێنکەوتوانی لە ناوچەکانی جەزیرەوە لە ساڵی ( ٧٥ك/ ٦٩٤ز)دا دەستی پێکرد، کە لەلایەن لایەنگرانی ساڵحەوە ئەنجامدرا٧٧،  زۆرێك لە گێڕانەوەکان باسی ئەوە دەکەن کە بوونی خەواریج بەهۆی زۆریی لایەنگرانیان لە ( دارا، نصیبین، موصل) دا وە کو ئایدۆلۆژیایەکی مەزهەبیو سیاسیی چەسپابوو،  دواتریش هەر ئەم هەوادارانەی خەواریج بوون، کە پەیوەندییان کرد بە سەرکردەی ڕۆحیانەوە لە هەرێمەکەدا کە ئەویش ساڵحی کوڕی مەسرەح بوو٧٨، لە لایەکی ترەوە شەبیبی کوڕی یەزیدی خارجیش  وەکو سەرکردەیەکی تری خەواریجەکان پەروەردەی ئەو بیروباوەڕەی خەواریج لە ناخیدا بوو، ئەویش توانایەکی بە هێزیی لە ڕاکێشانی خەڵکیدا هەبوو بۆ

بیروباوەڕەکەی٧٩، پاش ئەوەی لە شاری کوفەوە کۆچ دەکات بۆ ناو لایەنگرانی خەواریج لە موسڵ، ئیتر لەو شارەدا بەهۆی لایەنگیریی کردنیەوە لەلایەن هۆزی یاخی بووی شەیبانەوەو بەهۆی پشتیوانیکردنیەوە لەلایەن کوردەکانی هەرێمەکەوە، کە پەیوەندیەکی بەهێزیان لەتەك بنەماڵەی شەیبان هەبوو، هەروەها بەهۆی بەندایەتیو گۆشەگیریو بەرزی کەسایەتی خۆیەوە لە ژیانیدا، ڕاستەوخۆ یارمەتی درا تاوەکو لە وولاتی جەزیرەدا توانی سەرکەوتنێکی گەورە بە دەست بهێنێتو هەوادارانێکی بێشومار لە دەوروبەریدا کۆبکاتەوە، سەرەتای جوڵانەوەکانو یەکگرتنی سەرانی خەواریج لە مەوسیمی حەجدا ڕوویدا، ئەوەبوو لەحەجی ساڵی ( ٧٦ك/ ٦٩٥ز)دا و لەوکاتەدا شەبیب بە نیازی حەجکردنەوە پەیوەندی دەکات بە صالح و لایەنگرانیەوە لەخەڵکی داراو دەوروبەری کە ئەوانیش لەحەج بوون، ئیتر هەموویان ڕێکدەکەون بۆ شۆڕش دژی خەلیفە، بەلام پێشتر خەلیفە عەبدولمەلیك بەنەخشەو پیلانو ڕێکخستنی کۆبونەوەکانی خەواریجی جەزیرە دەزانێتو دەنێرێت بە شوێنی حەجاج دا بۆ تەمبێکردنیان، هەربۆیە شەبیب دەگەڕێتەوە بۆ وولاتی جەزیرە و پەیوەندی دەکات بە سالحی کوڕی مەسرەحەوە تا ڕاستەوخۆ شۆڕشەکەیان ئاشکرا بکەن٨٠، سالحیش وەکو سەرکردەیەك کە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لە کارکردنە سەرخەڵك ٨١، هەروەها زۆری بەندایەتیەکەی جەماوەرێکی زۆری لە دەور کۆکردبویەوەو هەستێکی کارێزمیانەی هەبوو بۆ سەرکردایەتی کردن، ئەوە بوو بڕیاری ڕاپەڕینی دا، لەم کاتەشدا بەهۆی مردنی والی عیراق زیادی کوڕی سوفیانەوە گۆڕانێکی زۆر لە کوفەدا ڕوویدا، ئەو گۆڕانەش بریتی بوو لە تەسککردنەوەی ئازادیەکان، کە ئەمەش زەمینەیەکی لە باربوو بۆدەستپێکردنی شۆڕشەکە، ئیتر تەواوی چالاکیەکانیان لە کوفەو جەزیرەداو لە نێوان ( کوفە، دارا، نصیبین، ماردین)دا چڕکردەوەو دەوڵەتیان بەتەواوی هەراسانکرد، هەروەها لە شاری موسڵیشدا چالاکیەکانی خەواریج هەلی ئاڵۆزیەکانی عێراقیان قۆستەوەو ڕۆڵێکی گەورەیان گێڕاو لایەنگرانێکی زۆریان بە پەروەردەی قورئانیو زانیاری فیقهییەوە بۆ

شۆڕش جۆشدا، بەجۆرێك توانیان کۆمەڵەیەکی بەهێزی ناسراو بە پشتیوانانی سالَح پێك بهێنن٨٢، ئەمەش ئاماژەبوو بۆ ئەوەی کە ئەم شۆڕشە لەسەر بنچینەیەکی ئایدیالۆژی بووە٨٣، سەرەڕای ئەمەش ستەمی ئومەویەکان و دوورکەوتنەوەیان لە ڕاستی و دروستی ئیسلام و پتر دەوڵەمەندبوونی سەرکردەکانیان ڕۆڵی بەرچاوی هەبوو لە شۆڕش و کۆبونەوەی جەماوەری ڕەش و ڕووتدا٨٤، هەرچەندە ئەو ستەم و زۆرداریە نوێ نەبوو بەنیسبەت گەلانی ژێر دەستەی ئومەویەکان، بەلاَم ئەو گۆڕانانەی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان لە بەڕێوەبردنی وولاَتدا دایهێنان، بە تایبەتی لە هەرێمی جەزیرەدا زیاتر نەتەوە جیاوازەکانی ڕق ئەستورکرد٨٥، ئەو داهێنانەش بریتی بوون لە تەعریبکردنی دیوانەکان بەپلەی یەکەم، کە هۆکارێکی تری یاخی بوونی خەواریج و خەڵکی جە زیرە بوو، لە لایەکی تریشەوە پەیڕەوکردنی شێوازی دەرەبەگایەتی و وەرگرتنی باج لە موسڵمانانی ناعەرەب، بە شێوەیەك بو، کە دەرگای لەبەردەم شۆڕشی سالَحی کوڕی جەبردا کردەوە، هەر بۆیە لەموسڵەوە تا ئازەربایجان ٨٦، کە بەدرێژایی ئەو پانتاییە جوگرافیە پێکهاتەی نەتەوەی کورد نیشتەجێن، شۆڕش دەستی پێکرد، لەمکاتەدا موحەمەدی کوڕی مەروان والی هەرێمی جەزیرە بوو، موحەمەد بۆ یەکەمجار سوپایەك دەکاتە سەر یاخیبووان لە هەرێمەکەدا، سوپاکەش بەسەرکردایەتی عەدی کوڕی عەدی بوو، بەلاَم ناتوانێت لەبەردەم هێزی خەواریجدا خۆبڕابگرێت، بوجاری دووەم حەجاجی کوڕی یوسف هەست بە گەورەیی ئەم مەترسییە دەکات و ( ٣٠٠٠) جەنگاوەر لە خەڵکی کوفە دە نێرێت بۆ جەزیرە، ئەمەش بەسەرکردایەتی حارسی کوڕی عومەیرە دەبێت لە ساڵی ( ٧٦ك / ٦٩٥ز)، ئەم سەرکردە سەربازیەی حەجاج توانی گەمارۆی خەواریجەکان بدات لە شوێنێکی نزیك موسڵ بەناوی ( المد بج)* لەم گەمارۆدانەدا جەنگ ڕوودەدات و تیایدا سالَحی کوڕی مەسرەح سەرکردەی خەواریجەکان دەکوژرێت و شەبیبی کوڕی شەیبانیش بریندار دەبێت، ئیتر سوپای خەلیفە دەتوانێت پاشەکشە بە خەواریجەکان بکات٨٧، دووای کوژرانی سالَح،

شەبیب سەرکردایەتی خەواریجە صەفەریەکان دەگرێتە دەست، دیارە ئەم تێکشکانە خەواریجەکانی لە شۆڕش نەوەستاند، بگرە پاشماوەکانیان تونییان ڕیزەکانیان ڕێکبخەنەوە بۆبەرەنگار بوونەوەیەکی نوێ بەسەرکردایەتی سەرکردەی نوێ شەبیبی کوڕی شەیبان، ئەوەبوو ئەویش لایەنگرانی خۆی جارێکیتر لە موسلْ بەڵێنیان پێدایەوە ٨٨، لەم کاتەدا حەجاج لەلایەن خەلیفەوە ساڵی ( ٧٧ك/ ٦٦٩ن) کرا بە والی عێراق و ئیتر ئەرکی سەرەکی ئەم فەرمانڕەوایەش تەرخانکرا بۆ لێدانی خەواریج، چونکە حەجاج لە هەموو فەرمانڕەوایانی سەردەمی خۆی توندترو ملهوڕتر بوو، دیارە هەروا ئاسان نەبوو ئومەویەکان هەڵسوڕانی ناوچەکانی ڕۆژهەلاتیان بەو سپارد بووە٨٩، کەچی لە بەرامبەر ستەمەکانی حەجاجدا تا دەهات بزووتنەوەکەی شەبیب لەناوچەکانی ( دسکرە*، موصل، نهروان، حولوان، خانقین، نصیبین، امەد ) فراوانتر دەبوو، ئەوان بەئاشکرا خەڵکیان لە دژی دەوڵەتی ئومەوی کۆدەکردەوە، هەربۆیە ئەم بزووتنەوەیە بە بەهێزترین جوڵانەوە دادەنرێ، کە عێراق و هەرێمە دراوسێکانی گرتبویەوە٩٠، هەروەها هەرێمی چیاکانیشی کە مەڵبەندێکی کوردنشینە کردبوویە مەڵبەندێك بۆ پاراستنیان و بنکەیەك بۆ دەستپێکردنی هێرشە کانیان بۆسەر دەوڵەت، بەمجۆرە خەواریجەکان توانییان هەرێمەکانی عێراق و چیاکان بکەنە مەیدانی هەڵسوکەوتەکانیان٩١، ئەوان لەو ماوەیەدا توانییان کۆمەڵێك هۆزی کوردی لە هەرێمی چیاکان و حولوان و ناوچە شاخاوییەکانەوە بۆ لای خۆیان رابکێشێن٩٢، هەروەها هۆزی بەکری کوڕی وائیل وەك هۆزێکی گەورەی عەرەبی و ناقورەیشی لە ڕیزەکانی بزووتنەوەکەی شەبیبدا ڕێککەوتن، بەمجۆرە سنوری بانگەشەکانیان جەزیرەو موسڵی بەزاندو تا ئازەربایجانیشی گرتەوە٩٣، سەبارەت بە پێکدادانەکانیشیان لەگەڵ ئۆردوی ئومەویەکاندا، سەرەتا موحەمەدی کوڕی مەروانی سەرداری سوپای ئومەوی لە جەزیرەدا بەرەنگارییان بوونەوە، بەڵام خەواریجەکان لەم جەنگەدا دەتوانن سەرکەوتن بە دەست بهێنن، لەگەڵ بیستنی هەواڵی ئەم شکستەدا حەجاج دەنوسێ بۆ

( سفیان بن عالیه الاخشعی) و پێی ڕا دەگەیەنێت لەگەڵ تەواوی سوار چاکەکانیدا لە ەوە بگەڕێتەوە تەبەرستانەوە بۆ جەنگی شەبیب، ئەوەبوو سوفیان گەڕایەوەو لە خانەقین بەرەنگاری شەبیب بوونەوە٩٤، لەو شارە کوردنشینەداو لەنێوان هەردوولادا شەڕێکی سەخت ڕوویدا، لەئاکامدا سوفیان‌و سوپاکەی حەجاج بەسەر شەبیبدا لەنێوچەکانی نەهرەوان‌و خانەقیندا زاڵدەبن٩٥، بەمجۆرە حەجاج توانی بزووتنەوەکەی شەبیب تێکبشکێنێ، بەشێوەیەك کە لە ساڵی ( ٧٧ك/ ٦٩٦ز)٩٦ یا( ٧٨ك/ ٦٩٧ز) کۆتاییان پێدێت٩٧، سەرچاوەکان لەم بارەیەوە دەڵێن شەبیب خۆیی‌و ژنەکەی لە ڕووباری کاروخی ئێستادا خنکان٩٨، ئەمە لە کاتێکدا بوو سوفیان بە هاوکاری ( ٤...) جەنگاوەر لە خەڵکی بەسرە بەدوویانەوە بوون. ئەوەی گرنگ بێت لەم بزووتنەوەیەدا کۆبوونەوەی نەتەوە جیاوازەکان‌و بیروباوەڕە جیاوازەکان بوو لە م بزووتنەوەدا کارلبرۆکلمان دەڵێ: مەسیحییەکانیش* سۆزێکی زۆریان بۆ شەبیب هەبوو: ٩٩، دیارە مەسیحییەکانی جەزیرەو موسڵیش لەمێژەوە تاوەکو ئێستا شوناس‌و ڕەچەڵکیان کورد بووەو بەکوردی ماونەتەوە، لە بەرئەوە ئەم بزووتنەوەیە بە بەهێزترین جوڵانەوەکانی خەواریج دێتە ئەژمار، چونکە توانی لە پانتایەکی فراوانی دەوڵەتدا بەشێکی گەورەی نەتەوەکان لەدژی دەوڵەت ڕاپەڕێنێت١٠٠...

## کوردو بزووتنەوەی بەهلولی کوڕی بشری خەواریجی

پاش فراوانبوونی چالاکییەکانی خەواریج لە هەرێمی جەزیرەداو لە سەردەمی خەلیفە هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا ( ١,٥-١٢٥ك/ ٧٢٣-٧٤٢ز)، ڕاپەڕینێکی بە هێز پەیدابوو لە ژێر سەرکردایەتی بەهلولی کوڕی بشری خەواریجی١,١، ئەم کەسایەتیە سەرەتای جوڵانەوەکەی لە دێیەك لە دێیەکانی موسڵەوە دەستپێکرد١,٢، دەرفەتی جوڵانەوەکەش لە کاتێکدا بوو کە لەسەفەری حەج لەگەڵ سەرانی تری خەواریج کۆبوویەوەو بەڵێنیان لەیەکتر

وەرگرت، ئیتر بە گەڕانەوەیان بڕیاری شۆڕشیاندا١٠٣١، دیارە لە سەرەتاوە (٤٠) جەنگاوەر لە دەوری کۆبوونەوە، ئەوەبوو دەستی کرد بە بانگەشە بۆ (الالوهیە) لە بەرامبەردا ( خالد القسری ) کە ئەوکات والی عێراق بوو، بەم جولآنەوەو بانگەشەیەی خەواریج نیگەران دەبێت، بەهلولیش بێ گوێدانە دەوڵەت بەردەوام دەبێت، ئەم تایبەتمەندیەکی جیاوازی لە خەواریجەکانیتر هەیە، هەربۆیە خاوەنی مەزهەبێکی لادەرە لە ئیسلام، بەهلول لە کارەکانیدا دەستدەکات بە تێکدانی مزگەوت‌و زاڵکردنی مەجوسەکان‌و نواندنی لێبوردەیی لەگەڵ ( اهل الزمە) دا، ئەمەش لە ڕووی ژن‌و ژنخوازیەوە١٠٤، دیارە هەموو ئەم کارانەش هەولێك بوون تاوەکو سەرنجی ناعەرەبەکانی نێوچەکە کە کورد بوون ڕابکێشێت بۆ لای خۆی، چونکە دەیزانی ئەوان گرفتاری ئەو بوارانەی ئابوری‌و کۆمەلآیەتین، لە ئاکامدا ( خالد القسری ) لە کاتێکدا سوپاکەی لە ڕێگای هیند بوو، فەرمانیان پێدەدات بگەڕێنەوەو بەرەو ڕووی خەواریج ببنەوە، ئەمە جگە لەو سوپایەی کە لەخەڵکی شام پێکی هێنابوون، لەگەڵ (٢٠٠) جەنگاوەری کوفەش، کە ئەوانیش چوونە پاڵ ئۆردوی والی عێراقەوە، بەلآم ئەم سوپایە لە بەردەم خەواریجدا تێکدەشکێن‌و شوێنیان دەکەون تا کوفە١٠٥، لەوێشەوە خەواریجەکان بڕیاریاندا ڕووبکەنە شام بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئومەویەکان، بەلآم خەلیفە هیشام لە بەرامبەردا بڕیاری ڕووبەڕووبونەوەی توندیدا، ئەوەبوو سوپایەکی (٢٠) هەزار جەنگاوەری لە دانیشتوانی شام‌و هەرێمی جەزیرە عێراق کۆکردنەوەو لەئاکامدا توانییان بەهلول‌و لایەنگرانیی لە نێوبەرن١٠٦ لە شوێنێکدا بە ناوی ( کحیل ) توانیان بەهلول بکوژن١٠٧، سەبارەت بە بوونی کورد لە و، دیارە ڕاستە بزووتنەوەی خەواریج لە هەرێمە کوردیەکاندا دەرکەوتوون بەلآم پێکهێنانی سوپایەکی ( ٢٠) هەزار جەنگاوەری لە خەڵکی جەزیرەو شام ئەوە دەردەخات کە کوردەکان بەشێکیان لە ڕیزەکانی ئومەویەکاندا بوون‌و سیاسەتی ئومەویەکان بواری بۆ بانگەشەی خەواریج لەو ناوچانەدا بە ئاسانی نەداوە، دیارە هۆکاری ئەمەش هەروەکو ( ابن المهلهل) دەڵێت: لە سەردە

می خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا ( ٩٩-١٠١ك) دا پەیوەندی کوردو ئومەویەکان زۆرباش بوو١٠٨، هەربۆیە خەواریجەکانیش لە ناوچە کوردیەکان لایەنگرانیان کەم بوونەوە، ئاشکرایە خەلیفە هیشام بۆماوەی سێ ساڵ لە دوای خەلیفە عومەرەوە دەسەڵاتی گرتووەتە دەست، هەر بۆیە ئاسانکاری بۆکرابوو لەسستکردنی نەیارانی دەوڵەتدا، بەتایبەتی کوردەکان ئەوکاتە لەسەرەتای ناڕازیبونی دۆخە نوێیەکانی دوای خەلیفە عومەردا بوون.

## کوردو بزووتنەوەی سەعدی کوڕی مەجدەلی شەیبانی

ئەم بزووتنەوەیە لە ( کفر توپای)* هەرێمی جەزیرە دەستی پێکرد، بزووتنەوەکە لەمانگی شەعبانی ساڵی ( ١٢٦ك/ ٧٤٣ن)دا بوو١٠٩، ئەم ڕاپەڕینە کەمتر لە دوو مانگ تێپەڕی بوو بە سەر کوژرانی خەلیفە وەلیدی کوڕی یەزیدا، واتە لە کاتێکدا بوو کە بارودۆخی ئومەویەکان ڕووی لە شێواوی کردبوو، والی جەزیرەش سەرگەرمی ڕووداوەکانی شام بوو١١٠، ( سعید بن مجد ل)* لە سەرەتاوە ئاڵۆزی ئومەویەکانی بە هەلزانی، هەربۆیە لەگەڵ ( ٢٠٠) جەنگاوەر لە لایەنگرانی یاخیبوو١١١، کە هەموویان خەڵکی هەرێمی جەزیرەبوون١١٢، سەرەتا ئامانجیی ئەم بزووتنەوەیە دەست بەسەردا گرتنی ناوچەی جەزیرە و پاککردنەوەی بوو لە دەستی مەروانی کوڕی موحەمەد، کە ئەوکات والی هەرێمەکە بوو١١٣، ئەم بزووتنەوەیەی ( سعد بن مجدل) هاوکات بوو لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕەوتەکانی تری خەواریج لە ناوچە جیا جیاکاندا لە وانە بزووتنەوەی (ابو کرب الحمیری ) لە ( مرج) ی ناوچەی موسڵ، هەروەها هاوکاتبوو لەگەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ( شیبان الیشکری ) لە شارەزوور، ئەوە بوو سەعد گەڕابەو ناوچانەشدا کە خەواریجی لێبوون و لەگەڵ سەرکردەی هەریەك لە بزووتنەوەکانی شارەزوورو مەرج کۆبوویەوەو ڕازیکردن بە هاتنە ناوەوەیان و یەکبوونیان١١٤، دوواجار بڕیاریاندا لە چوارچێوەی کۆمەڵێکی یەکگرتوو و بەباوەڕێکی پتەوەوە لە پێناو

ئامانجەکانیان تێ بکۆشن دژی پیلانەکانی دەوڵەت١١٥، دیارە شەیبان پێش پەیوەندی کردنی بە بزووتنەوەکەی سەعدی کوڕی مەجدەلەوە سەرکردایەتی ڕەوتی خەواریجی دەکرد لە شارەزووردا و بەیارمەتی کوردی ناوچەکە زاڵ بووبوو بەسەر یەکێك لە لێپرسراوانی دەوڵەتی ئومەویدا ١١٦، ئیتر پاش بەهێز بوونی لە شارە زووردا، لەگەڵ بزووتنەوەکەی سەعد یەکیانگرت١١٧و بەمەش قۆناغێکی نوێ لە بەرەنگابوونەوەی ئومەویەکان دەستیپێکرد، بە جۆرێك لە ناوچە جیاوازە کاندا دە وڵەت بەتەواوی هەرا سان بوبوو١١٨، چونکە یەکگرتنی خەواریجەکان لەکاتێکدا بوو، کە سەرانی ئومەوی لەنێو خۆیاندا لەپەرتبوندا بوون‌و یەکترییان سەردەبڕی، پاش یە کگرتنی ڕەوتەکانی خەواریج، ئیتر بەشێکی چالاکی بزووتنەوەکە ڕوودەکەتە شارەزوور١١٩ و بەهاریکاری کوردەکانی ئەو ناوچەیە دەبنە هێزێکی گەورەی بەرهەڵستکاری دەوڵەت، بەجۆرێك ژمارەیان دە گاتە ( ٤٠٠٠) جە نگاوەر، هەربۆیە ( ابن الا ثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت: هیچ جولآنەوەیەکی خەواریج هێندە خەڵکی لەدەورکۆنەبوو بوویەوە:١٢٠، بەلآم ئەوەی لە هێزی ئەم جولآنەوەی کەم کردووە دروست بوونی ململانێی نێوان سەعد بوو لە گەڵ ( بسگام بن لیپ التغلبی)* کە یەکێك بوو لە سەرکردەکانی خەواریج لە لەئازەربایجان، ئەم سەرکردەیە لەخەواریجە بەیهەسیەکان بوو، هەر بۆیە جیاوازی مەزهەبییان لەتەك یەکتریدا لێکەورە بووبوو، بەم جۆرە ئەو تایبەتمەندی یەکڕیزیەی کەخەواریجەکانی جەزیرەو شارەزووری بەرەو سەرکەوتن برد، ئێستا ململانێکانیان لەتەك بەیهەسیەکانی ئازەربایجاندا بەرەو شکستی دەبردن، بەیهەسیەکان توند بوون‌و تەنانەت بڕیاری کو شتنی منداڵیان دابوو، ئەوان زۆر توند ڕەو بوو لە بیروباوەڕدا، ئەوەبوو لە ساڵی ( ١٢٦ك/٧٤٨ز) دا کارگێڕی مەروانی کوڕی موحەمەد لە ئازەربایجان بەدەستیان کوژرا، ڕاپەڕینی بەیهەسیەکان بەجۆرێك بوو لە ئازەربایجانەوە ڕووەو هەرێمی جەزیرە تەشەنەی دەکرد، ئەوان دەنگۆیان گەیشتبوویە سنوری دەڤەری موسڵ١٢١، سەبارەت بە کوردەکان‌و هەڵوێستیان لە بەرامبەر ئەم ڕەوتەدا،

ئـەوا كوردەكـانى شـوێنكەوتەى سـەعد لـە هـەرێمى شـارەزووردا دژى بەيهەسـيەكان لەجەنگـدا بـوون١٢٢، ديـارە نـاكۆكى بيروبـاوەڕ لـە نێـوان بەيهەسيەكانى ئـازەر بايجان‌و سـەفەريەكانى جەزيرە كـە لـە شارەزووريشدا هـەبوون، ئـەوانى بـۆ جـەنگ سـازدابوو١٢٣، هەربۆيـە كوردەكـانيش لـە شـارەزووردا كەوتنـە بـەردەم لێـشاوى جـەنگى بەيهەسـيەكانەوە، چـونكە لەبەرەى سەعد بوون١٢٤، بەلاّم هەندێ لە كوردەكان لە ناوچەكانى ( بازيدى موصل) ڕازى بوون بە بيروباوەڕى بەستامى بەيهەسى‌و بوونە لايەنگريان١٢٥، لەئاكامدا ناكۆكى ئەم ڕەوتانەى خەواريج كۆتايى هـات بـە كـوژرانى بەستام لەلايەن سوپاى سەعدەوە، ئـيتر سـەعد ئـەم سـەركەوتنە بەهـەل دەزانێـت‌و بـەرەو عێـراق دەكـشێت، چـونكە لـەو كاتـەدا مـەروانى كـوڕى موحەمـەد سـەرگەرميى نـاكۆكى بنەماڵەكـەيان بـوو١٢٦، لەگـەڵ ئەمەشـدا سـەعد بـە ئامانجەكانى ناگات، چونكە بە هۆى بلاّووبونەوەى نەخۆشى تاعونەوە لـەنێو سوپاكەيدا هەر لە شارەزووردا دەمرێت‌و لەدواى خۆى زوحاكى كوڕى قەيسى شەيبانى جێگاى دەگرێتەوەو درێژە بەبانگەوازەكەى دەدات١٢٧.

ديارە سەرنەكەوتنى ئەو بزووتنەوە بەرفراوانـە لەكاتێكدا كـە ئومەويـەكان لـە لێوارى مەرگدا بوون، هۆكارى ڕاستەوخۆى دەگەڕايەوە بۆ ململانێـى نـاوخۆيى كوردەكان كە كورديش لەو كێشانە پێچرابوون، بەجۆرێك هەندێكيان لايەنگيرى سەفەريەكان‌و هەندێكيشيان لەتەك بەيهەسيەكانبوون، بەشێكيشيان لەدەورى ئومەويەكان مابوونـەوە، ئەمـەش سـيماى ديـارى هـەموو دۆڕان‌و شكستەكانە لەمێژوودا.

# باسی چوارەم:

# کوردو بزووتنەوەی خەواریج

# لە کۆتایی دەسەلاتی ئومەوییەکاندا

سالآنی کۆتایی فەرمانڕەوایەتی بنەماڵەی ئومەویەکان سالآنی بە خێراتر بوون و زیادبوونی بزووتنەوەکانی خەواریج بوو، بەتایبەتی لە ناوچەکانی هەرێمی جەزیرەدا، لەوێدا بە شێوەیەکی بەرچاو بیروباوەڕەکانیان بلآوبووبوویەوە١٢٨، کوردیش لەو نێوەندەدا کاریگەربوو بوون بە دروشمە کانیان، بە جۆرێك ئەم کاریگەرییانە سنوری جەزیرەیان بڕی و تەواویی ناوچەکانی هەرێمی چیاکان و تەنانەت ئازەربایجانیشیان گرتبوو یەوە١٢٩، دەوترێت گومان لەوەدا نییە کە بۆچوونی هەندێ لە کوردەکان بۆچوونێکی خەواریجی بووە ١٣٠، دیارە ئەم نەشونماکردنەی بیروباوەڕەکانیان هاندەرێکی باش بووە بۆ دەستپێکردنەوەی شۆڕشەکانی خەواریج بە گوڕو تینێکی نوێ ترەوە، یە کێکی تر لە هۆکارەکانی دەستپێکردنەوەی شۆڕش زۆربوونی کێشە ناوخۆییەکانی ناو بنەماڵەی ئومەویەکان بوو، بە تایبەتی لە سەردەمی مەروانی کوڕی موحەممەددا لە سالآنی ( ١٢٧-١٣٢ك/٧٤٤-٧٤٩ز)، دەرەنجامەکانی ئەم هۆکارانەش لە نێووچوونی ئومەویەکانی لێکەوتەوە١٣١، لەو ماوەیەدا لە هەرێمی جەزیرەدا زنجیرەیەك بزووتنەوەی بەرهەڵستکاریی جۆراو جۆر سەریانهەڵداو تەواوی هۆزەکانی ئەو هەرێمە کە پێکهاتەی دانیشتوانەکانیان لە خۆگرتبوو لە ڕیزی بزووتنەوەکاندا ڕێکخران، چونکە زۆربەی ئە وانە بەرهەڵستی سیاسەتی ئومەویەکان بوون، ئومەویەکان تا ئەو

کاتـەش سیاسـەتێکی نـەژادی توندو تیـژیان پـەیرەو دەکـرد، هەنـدێك لـەو بەرهەڵستکارانە لە ڕێگای نا ئارامیی دۆخی سیاسییەوە دەیانویست ڕاوو ڕووت و تالأنیان دەست بکەوێت١٣٢، دیارە ئەمەش سروشتی هەموو شۆڕشێکە کـە کەسانی هەلپەرست تێکەڵی خواستە ڕەواکانی بۆچوونی گشتی دەبـن، بـەم جۆرە ڕاپەڕینەکان سەرەتا لە هـەرێمی جـەزیرەوە دەسـتیان پێکـردوو دواتـر بەرەو تەواوی ناوچەکانی عـیراق کشانو دۆخێکی نـا ئاسـاییان بـۆ دەوڵـەتی خەلافـەت دروسـتکرد١٣٣، لێـرەوە لاوازی بـەڕێوەبردنی دەوڵـەت و سـەرە تاکانی لـە ناوچوونی دەرکـەوتو بێسەروبەری تـەواوی ناوچـەکانی دەوڵـەتی خەلافـەتی گرتـەوە، ئـیتر بـوارێکی فـراوان بـۆ سـەرکەوتنی بانگـەوازی عەباسییەکانیش کرایەوە، لە لایەکی تریشەوە دەمارگیری هۆزایـەتی ڕوویـەکی تری کێشەکانی ئەو سـەردەمە بوو، کـە لـە عێـراقو شـامو جـەزیرەو تـەواوی عەجەمـدا پـەرەی سـەندبوو، بـەجۆرێك لەلایـەك بزووتنەوەیـەك دادەمرکـا لەدوولاوە سەریهەڵدەدایەوە١٣٤..

## یەکەم: کوردو بزووتنەوەی زوحاکی کوڕی قەیسی شەیبانی

بزووتنـەوەکانی خـەواریج لـە ڕووی ڕێکخـستنەوە تۆکمـەو پێگەیـشتوبوون، بەتایبەتی لەهەرێمی جەزیرەدا بەتەواوی جوڵانـەوەکان ئاڕاسـتەیەکی سیاسـی بـەهێز دەیجوڵانـدن، هـەروەها لـە ڕووی کەسـایەتیو بـوونی سـەرکردەی لێهاتویشەوە تۆکمەو دەوڵەمەندبوون، دیارترینی ئـەو کەسـایەتییانە، کە لـە کۆتاییەکانی سـەردەمی ئومەویـدا نەخـشی بەرچـاویان لـە شکـستی دەوڵەتـدا هەبوو زوحاکی کوڕی قەیـسی شـەیبانی* بـوو، ئـەو وەك سـەرکردەیەکی بـە توانا هەر لە سەرەتاوە هەوڵی دەدا بزووتنـەوەی خـەواریج بـەرەو سـەرکەوتن بـەڕێتو چـالاکییەکانیان فـراوانو پێـشبخات١٣٥، ئـەوەبوو زوحـاك تـوانی بزووتنـەوەی خـەواریج بکاتـە مەترسـیدارترین هێـزی بەرهەڵـستکار لەسـەر دەوڵەتی خەلافەت، بەشێوەیەك جوڵانەوەکەی بە ترسناکترین هێزی مەترسی

دادەنرا لە پێش دەسەلاتگرتنە دەستی عەباسییەکانەوە١٣٦، مێژوونوسان دەڵێن ئەگەر هۆکارە ناوخۆییەکانی ناو خودی بزووتنەوەی خەواریج نەبووایە، ئەوا کورسی خەلافەت بۆ خەواریجەکان دەبوو نەك بۆ عەباسیەکان، چونکە ئەوان دوورترو بێ پشتیوانتر بوون وەك لە خەواریجەکان، لە دۆخێکی لەو جۆرەشدا سەنگو بایەخی کوردان بە ئاراستەو چارەنوسێکی تردا دەچوو، زوحاك لە یەکەم هەنگاوی چالاکییەکانیدا دەیەویست لە جەزیرەوە ڕوو بکاتە شام١٣٧، بۆ ئەوەی دژی ئومەویەکانو مەڵبەندەکەیان بوەستێتەوە، بەلام لایەنگرانی بەم نەخشەیە قایل نەبوون١٣٨، هەر بۆیە زوحاك ناچار ڕووی کردە شارەزوورو لەوێ نیشتەجێ بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو کوردەکان لەو ناوچەیەدا هاریکاریان دەکرد، تەنانەت پێش ئەوەی زوحاكو لایەنگرانی ڕوو لە شارەزوور بکەن، شارەزووریەکان وەکو خەواریج بیریان دەکردەوە، بە گەیشتنی زوحاکیش بۆ ئەوێ ژمارەیەکی زۆر لە خەواریجە سەفەریەکانی شارەزوور دەچنە ڕیزەکانیانەوە، بەجۆرێك کە جەنگاوەرانیان ژمارەیان دەگاتە( ٤٠٠٠)، سەرچاوەکان دەڵێن هیچ لە خەواریجەکان هێندەی سەرکردەیەکی وەکو زوحاك جەنگاوەری لەدەورو بەردا نەبوون١٣٩، ئیتر پاش ئەوەی هێزی زوحاك لە شارەزووردا جێگیردەبێت، ڕیزەکانی خۆیان بەنەزمێکی پێشکەوتوو لەژێر سایەی سەردارەکەیاندا ڕێکدەخەن١٤٠. ئەوان لەوێ مانەوە تاوەکو هاتنە سەر کورسی مەروانی کوڕی موحەمەد ساڵی ( ١٢٧ك/ ٧٤٤ز)، ئیتر پاش هاریکاریکردنیان و ڕێکخستنی هێزەکانیان، پێیانوابوو کاتی ئەوە هاتووە بەرەو کوفەو سەنگەرەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی خەلافەت بکشێن١٤١، دوواجار لە هەمان ساڵی هاتنە سەر تەختی مەرواندا زوحاك توانی دەست بەسەر تەواوی کوفەدا بگرێت، ئەم شارە گەورەترین شوێن بوو کە لە ژێر دەستی بەڕێوبەرایەتی بنەماڵەی ئومەویەکان دەرهێنرا، بەلام لە بەر نائارامی بارودۆخی ناوخۆی خەواریجەکان، کە بەردەوام بگرەو بەردەکانو حەرامو حەلالەکانی مەزهەبەکەیان دوچاری لێدانی سەختی کردونەتەوە، لە بەرئەو هۆکارانە زوحاك نەیتوانی لەشارەکەدا بمێنێتەوەو

دووباره ڕووی کردەوە هەرێمی جەزیرەی زێدی خۆی١٤٢، بەلآم لەکاتی تێپەڕبوونی جەنگاوەرەکانی بە ناوچەکانی جەزیرەدا بە شێوەیەکی فراوان کوردەکانی ئەو ناوچەیەو خەڵکی جەزیرە دەهاتنە نێو ڕیزەکانیانەوە١٤٣، بەجۆرێك وەکو سوپایەکی ڕزگاریخوازو فریادڕەسێك پێشوازییان لێدەکراو هەیبەتی خەلیفەو ئومەویەکان بەتەواوی خرابوویە لاوە، ئیتر هەموو کاربەدەستو پیاوانی دەوڵەتییان لە سنورەکەدا گرتو کوشتو ڕاونا، بۆ نمونە زوحاك توانی والی موسڵ ( قطران بن اكمة) بە دەستی خۆی بکوژێتو ١٤٤شاری موسڵ بخاتە ژێر دەستی خۆیەوە١٤٥، هێندە جوڵانەوەکەی زوحاك تۆکمەو بەهێز بوو، سەرچاوەکان دەڵێن لەکاتی تێپەڕبوونی زوحاك بە هەرێمی جەزیرەو سنوری موسڵدا ( ٣٠٠٠) جەنگاوەر هاتنە ڕیزەکانیانەوە، هەربۆیە لێرەوە خواستی بەرهەڵستکاری زوحاكو دانیشتوانی ناوچەکە دژی دەوڵەت فراوانترو ئیرادەیان گەورەتر بوو بۆ سەرکەوتن١٤٦، دیارە ئەم پشتیوانیەی جەماوەر دەگەڕایەوە بۆ هەیمەنەی بنەماڵەی شەیبانو دەسەلآتییان لە پێشینەی ناوچەکەداو بەتایبەتی لە موسڵدا، ئیتر ئەم بنەماڵە توانیان بۆچوونە خەواریجیەکانی ئەوسەردەمە لەخۆیاندا زیندوو ڕاگرن، تا زیاتر تواناو هەیمەنەی خۆیان بسەپێننو هەموو نەتەوەو چینە جوداکان لەڕاپەڕینی زوحاکدا بەشدار بکەن١٤٧، بەم جۆرە پێکەوە ژیانی دانیشتوانی جەزیرە لەڕیزەکانی خەواریج بوو بوو بەهۆی بەهێزی زوحاك، ئەمەش یارمەتی دەری زوحاك بوو تا ئەمجارەیان نەخشەیەکی سەرکەوتوانە دابنێت بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دەسەلآتی سیاسی ئومەویەکان لە دیمەشق١٤٨.

سەبارەت بە نەخشو دەستی کوردەکانیش لەم بزووتنەوەیەدا ئەوا هەڵوێستێکی دوولایەنانە دەبینرێت، بەلآم بەشێوەیەکی گشتی کورد لەڕیزەکانی زوحاکدا خۆیان دیوەتەوەو مەچەکی بەهێزی بزووتنەوەکەی بوون، ڕەنگە تەنها کوردانێك لەم بزووتنەویەدا نەبووبن، کە پیاوی دەوڵەت یان لەسەر مەزهەبێکی تری خەواریجی دژی مەزهەبەکەی زوحاك بوون، کە پێیان دەوترا خەواریجە بەیهەسیەکان، هەندێك لە سەرچاوەکان ئەوە دەڵێن،

کـه لـەکاتی گرتنـی شـاری موسـڵدا ناعەرەبـەکان لـەدژی ئـۆردووی زوحـاك جەنگاون، لەم بارەیەوە ( ابن خیاط) دەڵێت: دەرچوون بۆ کوشتنی زوحاك، بەڵام توانیی بیانکوژێت: ١٤٩، یان پێدەچێت هەڵوێستی جیاوازی ئەم جارەی کورد بگەڕێتەوە بۆ خەلیفەو شوێن‌و کاریگەری مەروانی کوڕی موحەمەد لەنێو کوردەکاندا، چونکە ئەم خەلیفەیەی ئومەوی دایکی کورد بووەو خۆیشی لـە ناوچە کوردیەکانی هەرێمی جەزیرە لە دایکبووە و پێگەیشتنی کۆمەڵایـەتی‌و ژینگەی خێزانیی لەناو کوردەکانـدا گەشـەی کـوردووەو پـەروەردە بـووە١٥٠، ئەمە لە کاتێکدا بوو بزووتنەوەی خـەواریج لـە هەرێمـە کوردیـەکانی تـری وەك هەرێمی چیاکان‌و چەندین شـوێنی تـردا فـراوان دەبـوو١٥١، ئەمـەش هۆکـاری ئەوە بوو کە یەکەمجار زوحاك لە شارەزووردا ئەو هەسـتەی لا درووسـتبوو کـە بەیامەتی کورد بتوانێت کوفە بگرێت، بەڵام دوواتر کێشەی ئـەو کوردانـەی کـە لە جەزیرەدا کاریگەر بوون بە مـەروانی خەلیفـە پاشەکشەی بـەزوحاك کـردوو گەڕایەوە هەرێمەکەی، تا دۆخەکە ئاسایی بکاتـەوەو گوتارەکـانی ڕوونـتر بـۆ خەڵکی ئەویێ پیشانبدات، ئـیتر ئـەوە بـوو کوردەکـان تێگەیـشتن‌و خواسـتی مەزهەبی خەواریجەکانیان بۆ ڕوونتر بوویەوە، بە تایبەتی دوای گرتنـی موسـڵ ڕۆژ بـەڕۆژ کوردەکـان ڕوویـان دەکـردەوە ڕیزەکـانی خـەواریج، بـە جۆرێـك ژمارەیـان گەیشتە ( ٤٠٠٠) جـەنگاوەر١٥٢، ( البلاذری ) لـەم بارەیـەوەو لـە زمانی هاوەڵێکی زوحاکەوە دەڵێت: لەوەتـەی مرۆڤایـەتی هەیـە هـیچ پیاوێـك لەسەر ئەو بیروڕایە، هێندەی لە دەور کۆنەبوونەتـەوە:١٥٣، دیـارە ئەمـەش بەڵگەی زۆری ژمارەی سوپای زوحاك دەردەخات، هۆکارەکـەش دەگەڕێتـەوە بۆ هەوڵدانی خەڵکی هەرێمەکان‌و نیـازی پاکبونـەوەیان لـە حـوکمی بنەماڵـەی ئومەوی ئیتر بەهەر نرخێك بێت١٥٤، لە بەرامبەردا ئومەویـەکان هەوڵـەکانیان بۆ بەرگرتن لە مەترسییەکانی خەواریج بە پەرۆشەوە دەخەنەوە گەڕ، بەمەش خەلیفە مەروان داوا دەکات لە عەبدوڵای کوڕی تاوەکو بە لەشکرێکەوە ڕووەو ( نـصیبین) بـچێت‌و لـەو بەرەیـەوە زوحـاك لـە نێوەنـدی هـەرێمی جـەزیرەدا گەمارۆ بدات١٥٥، دیارە لەگەڵ ئەوەی کوردەکان هێزێکی سـەرەکی سـوپای

زحاك بوون‌و سوپایەکی تۆکمەی خەواریج لە ناوچەکەیاندا زۆرینەی لەوان پێکهاتبوو، بەڵام عەبدوڵلای کوڕی مەروان دەتوانێت شوێنی سەرەکییان لە ( نصیبین)ەوە بگرێت، لە کاتێکدا هێزەکانی عەبدوڵلا کەمتربوون لە خەواریجەکان١٥٦، لە ئاکامدا دوای گەمارۆدانێکی دوو مانگی ئومەوییەکان توانییان دەستبگرنەوە بەسەر تەواوی شارەکانداو تەواوی پارمەتییەکانی خەواریج کە لە جەزیرە و عێراق‌و شارەکانی ترەوە دەهات ڕێگایان لێبگرن‌و کۆتایان بکەن، بەمجۆرە زۆر بەخێرایی هێزیی ئامادەکراوی زوحاك ڕوو لە شکستدەکات١٥٧، دوواجار زوحاك خۆی بۆ دووایین جەنگی لە( کفر توثا ) ئامادە دەکات، ئەوە تا ڕادەیەك چانسی زوحاك‌و بزاڤی خەواریجی هەستاندبوویەوە، ئەوە بوو، کە سولەیمانی کوڕی هیشام هاتبوویە ڕیزەکانی خەواریجەوە لە( نصیبین)، لەئاکامدا جەنگێکی سەخت لە نێوان زوحاك‌و هێزەکانی مەروانی کوڕی موحەمەدی خەلیفە، کە خۆی سەر پەرشتی ڕەوشەکەی دەکرد ڕوویدا، لە سەرەتادا خەواریجەکان زۆر ئازایانە دەجەنگان‌و سەر کەوتوو بوون، بەڵام لە هەولێکدا فرسەت لە زوحاك دەهێنن‌و دەیکوژن١٥٨، ئیتر کوژرانەکەی لە ئەیلولی ( ١٢٨ك/٧٥٥ز) دا دەبێتە دەسپێکی نەگبەتی بۆ لایەنگرو جەنگاوەرەکانی‌و لەجەنگەکەدا شکستدەهێنن١٥٩، بەڵام پاشماوەکانی خەواریج هەر بەردەوام دەبن‌و پاشماوەیەك خۆیان ڕێکدەخەنەوەو دەستدەکەنەوە بەڕاپەڕین١٦٠.

## دووەم: کوردو بزووتنەوەی شەیبانی کوڕی عەبدولعەزیزی یەشکری

لە ساڵی ( ١٢٨ك/ ٧٤٥ز) دا شەیبانی کوڕی عەبدولعەزیزی یەشکری سەرۆکایەتی بزووتنەوەیەکی بە هێزی خەواریجی کرد، ئەم بزووتنەوەیە لە کاتێکدا بوو ئومەویەکان لەکۆتایی تەمەنی حوکمڕانییاندا بوون، هەربۆیە مەترسییەکی گەورەی بۆ سەردەوڵەتی خەلافەت دروستکرد١٦١و زەمینەیەکی لەباری بۆ بانگەوازی عەباسییەکان ڕەخساند لەو کاتە ئاڵۆزەی تەمەنی سیاسی ئومەویەکاندا، چونکە دەوڵەتی خەلافەت لەبەر سەرقاڵی بەم بزووتنەوەیەوە لە هەرێمی جەزیرەدا بێئاگا بوو بوو لە پشێویەکانی هەرێمە دوورە دەستەکانو تایبەتمەنیەتی ناوەندێتی لە تەواوی هەرێمە دورەکانی تر لە دەستدابوو١٦٢، ئەو کاتیش لە جەزیرەدا خەواریجی سەفەریە دوای چەندینجار خۆیان ڕێکخستەوە، دیسانەوە پێکهاتەی ڕەگەزی ئەمجارەشیان بریتی بوون لە هۆزی ڕەبیعەو ناعەرەب و مەسیحیەکان١٦٣، کە بێگومان مەبەست لێیان کوردەکانن، دیارە کە ئەمجارەش ئامانجە هاوبەشەکانی خۆ بەڕێوەبەریی‌و یەکسان ژیان هەموویانی ڕێکخستبوو١٦٤، هەروەها وەکو سروستی هەمیشەیی هەموو پادشاگەردانی‌و بێسەروبەریەك کە ڕوو لە دەوڵەتی نێوەندی دەنێت، لەم بزووتنەوەیەشدا کەسانی هەلپەرستو تالانچی‌و دزو مرۆڤە تاوانبارو بێ مۆڕاڵەکان تێکەڵی بزووتنەوەکە بووبوون و بەهەموویانەوە دەستیان گرتبوو بەسەر شاری ( البوازیج) دا لە هەرێمی جەزیرەدا، لە لایەکی تریشەوە ململانێی ناوخۆیی لە نێوان بنەماڵەی ئومەوییەکان، کە لەو سەردەمەدا زۆر بەبەرچاوی تاوی سەندبوو١٦٥، هۆکارێکی تری شۆڕش بوو، شەیبان لە سەرەتاوە لە ڕیزی جەنگاوەرەکانی زوحاکدا بوو، بەڵام پاش کوژرانی زوحاك بەڵێن دەدەن بە شەیبانو ڕوو دەکەنە موسڵ١٦٦، لەوێشدا تێکشکانێکی سەخت لەسەر دەستی مەروانی

کوڕی موحەمەد دەبێت بە بەشیان، هەروەها لە ساڵی ( ١٢٨ك) دا یە کێك لە سەرکردەکانی خەواریج بەناوی مەنسوری کوڕی جمهور لە ڕیزەکانیان جیادەبێتەوەو ڕوو دەکاتە هەرێمی چیاکان١٦٧، مەنسور هێزێکی تۆکمەی خەواریجەکانی لەتەکدا دەبێت، بەشێوەیەك دەتوانێت زاڵببێت بەسەر نەهاوەندو دەینەوەرو شارەکانی تری هەرێمی چیاکاندا١٦٨، ئەم ناوچە کوردیانە بەردەوام سەرچاوەی داهاتی بزووتنەوەکانی خەواریج بوون، لەمکاتەدا مەنسوریش دەتوانێت دەستبگرێت بەسەر ئەو داهاتانەی کە گروپەکانی خەواریج ئیتر لە ناوچە کوردیەکاندا دەستیان دەکەوت، بەڵام دیسانەوە مەروانی کوڕی موحەمەد بە ووردی چاودێری ئاکارو جوڵانەوەکانیان دەکاتەوە١٦٩، دوواجار لەناوچەکانی لێواری ڕووباری دیجلەدا بۆ ماوەی شەش مانگ گەمارۆیەکی توندیان دەدات١٧٠، لەم کاتەدا خەڵکی موسڵ و کوردەکانی ئەوێ وەك بێ لایەنێكو لە دەرەوەی خەواریج خۆیان ئاشکرا کرد بۆ ئومەوییەکانو بڕیاریاندا بەهیچ جۆرێك دژیان نەوەستن١٧١، ئەم هەڵوێستەش وەك باسکرا لە نفوسی مەڕوانەوە بێزار دەبێتو دەڵێت: ئەگەر بگەم بە خەڵکی موسڵ ئەوا دەیان کوژمو لە نێویان دەدەم :١٧٢، چونکە مەروان زیاد لەو هەڵوێستەی چاوەڕواندەکرد لێیانو پێی وابوو لە بەرەی ئەودا دەجەنگێن، بەمجۆرە موسڵ بوو بە بنکەیەکی خەواریجەکان بۆ دژایەتی خەلافەتو مەروان، هەربۆیە خەلیفەش گەمارۆیەکی توندی ئەو شارەیدا١٧٣، ( ابن الکثیر) لەم بارەیەوە دەڵێت: مەروانی کوڕی موحەمەد یەك ساڵ گەمارۆی خەواریجەکانیدا، لەو ماوەیەشدا هەموو بەیانیو ئێوارەیەك لێی دەکوشتن، ١٧٤، لە بەرامبەردا خەواریجەکانیش خەندەقیان دروست کردبوو بۆ بەرگریکردن لەخۆیان١٧٥، تا لە کۆتاییدا مەروان فەرمانی دابە یەزیدی کوڕی هوبەیرەی والی عێراق جەنگ دەستپێبکات لە دژیان، ئەوەبوو لە ناوچەی ( السن)* هەردوو لایەنی دژ بەیەك بەشەڕدێن١٧٦، لەمکاتەدا ناوچە کوردیەکان وەکو سەرچاوەی گەیشتنی کەرەستەی جەنگو جەنگاوەرانی خەواریج ڕۆڵی کاریگەری لە بەرگریکردنی

خەواریجەکان دەبێت١٧٧، بەڵام لە درێژەی فشارو جەنگانی بەردەوامو بێ پشوی ئومەوییەکاندا خەواریجەکان ناچار بە تێکشکان دەکرێن، ئیتر لە سەر داوای یەکێك لە هاوەڵانی شەیبان شاری موسڵ بە جێدەهێڵنو ڕوو دەکەنە شوێنێکی تری دورە دەستو ئارام کە ئەویش هەرێمی کوردنشینی شارەزوورە١٧٨، دیارە ئەم نەخشەیەش لەوەوە بوو کە شارەزووریەکان پێچەوانەی هەڵوێستی کوردانی موسڵو جەزیرە بەرامبەر بە مەروان سەختگیرو نەیار بوون، ئەوەبوو لەبەر ئەم هۆکارە بوو کە هاوڕێکەی شەیبان داوای کردو وتی ئەی ئەمیری بڕواداران بواری ژیانمان تەسك بووەتەوە، با ڕووبکەینە شوێنێکی تر :، ئیتر ڕوویان کردە شارەزوور، بەڵام شەیبان نەیتوانی لە شارەزووریش بمێنێتەوە، ڕەنگە هۆکاری ئەوەش نەیاری خەواریجەکانی ئەوێ بووبێت لەتەك شەیباندا، چونکە ئەو کاتانە مەنسوری خەواریج لە ناو شارەزووریەکاندا بوو، ئەم سەرکردەیەش وەك پێشتر ئامـاژەی بۆ کرا لە کۆمەڵی خەواریجەکانی جەزیرە نەیارو دژ بوو١٧٩، هەربۆیە شەیبان بە ناچاری ڕووی کردە عومانو دواتریش هەر لەسەر دەستی ئومەویەکان لەساڵی( ١٢٩ك) دا کوژراو کۆتایی هات بە جوڵانەوەکەی، سەرچاوەکان سەبارەت بە بەجێهێشتنی هەرێمە کوردیەکان لەلایەن شەیبانەوە دەڵێن: نەمانەوەی لە شارەزووردا دەگەڕێتەوە بۆ گەیشتنی سوپای ئومەوییەکان بۆ ناوچەکە:، تەنانەت لە عومانیش وازیان لێ نەهێناو لەسەر دەستی ( جلندی بن مسعود) دەکوژرێ، ئیتر پاش ماوەکانیشیان ڕوو دەکەنە خوراسانو پەیوەندی دەکەن بە جوڵانەوەی عەباسیەکانەوە، کە ئەوکات لە دۆخی خۆ ئامادەکردن بوون بۆ ڕووبەڕووبونەوەی ئومەویەکان١٨

# باسی پێنجەم:

# ئەنجام و کاریگەرییەکانی کوردو بزووتنەوەی خەواریج

خەواریجەکان کاریگەرییەکی زۆریان لە ناو کوردەکاندا بەجێ هێشت، بەجۆرێك پەیوەندییەکانیان تەنها بە بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکەیان لە ناو کورددا کۆتایی نەهات، بەڵکو بەشدارییەکی کردارەکیشیان هەبوو لە زۆربەی بزووتنەوەکانی خەواریجدا، ئەوان هێزی مرۆیی کوردەکان، مەچەکی بەهێزی تەواوی شۆڕشەکانیان بوو[181]، کورد بەردەوام لە دژی ئۆردووی خەلیفەو والیەکانی ناوەنددا ڕۆڵی گەورەی گۆڕانەکانیان دەبینی، دیارە ئەم بەشداریکردنەش سەرەڕای هۆکارە کلتوری‌و کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکان بەشێکی لە بڕوا بوونیانەوە بوو بە مەزهەبی گروپە جیاوازەکانی خەواریج، چونکە ئەو بیرکردنەوەیان لە زۆرێك لە ناوچە کوردیەکاندا وەکو مەزهەبێکی ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی بڵاو بوو بوویەوە، بۆ نموونە بە زۆرێکی ناوچە کوردییەکانی دەوروبەری موسڵ گوتراوە وولآتی شوراتەکان[182]، هەروەها ئەم مەزهەبە لەناو خەڵکی شاری داقوق کە شارێکی سەر بە هەرێمی جەزیرە یە بڵاوبوویەوەو بوو بە بنکەیەك بۆ هێزی مرۆیی خەواریجەکان، چونکە زۆرینەی لاوانی ئەوێ لە دەوریان کۆبوونەوە[183]، ئەم بڵاوبوونەوەیەی بیری خەواریج تەنها کورتنەکرابوویەوە لە ناو کوردەکانی هەرێمی جەزیرەدا[184]، بەڵکو لەچەندین شوێنی تری وەك هەندێك لە ناوچەکانی هەرێمی چیاکان‌و ئازەربایجاندا وەکوو بیروباوەڕ بوونیان هەبوو، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی هەرێمی جەزیرە بیروباوەڕی خەواریج و مەزهەبەکەیانی لە خۆگرتبوو[185]،

ئەگەر نا لە ناو هۆزە کوردیەکانی هەرێمی چیاکانیشدا وەك هەرێمی جەزیرە بۆچوونی هەندێك کورد بۆچوونێکی خەواریجیانە بوو، دیارە ڕاکێشان و کاریگەری بیری خەواریج لەناو کوردەکان بەمجۆرە، دەگەڕایەوە بۆ ئەو پرۆژە دادپەروەرییەی کە بانگەشەیان بۆ دەکرد، بەلام لە ڕاستیدا و بەشێوەیەکی کردارەکی بۆچوونەکانیان لە پرۆژە دیموکراسییەکانیاندا دۆڕاندیان، ئەم پرۆژەیە کە دەیانویست بیکەن بە ئەلتەرناتیڤێك بۆ کێشەی ئیمامەت لە ناو ژیانی سیاسی موسوڵماناندا، چونکە دیاردەی دووبەرەکی بوو بوویە مۆرکی ڕێکخستنە نهێنی و ئاشکراکانیان، لە لایەکی ترەوە توندڕەوی لە بڕیارو بیروڕاکانیان مۆرکی ئازادی و دیموکراسی کاڵکردبوویەوە١٨٦، هەروەها زیادەڕەویی کردنیش لە حوکمە شەرعیەکاندا ڕوویەکی تری شکستی پرۆژەکەیان بوو١٨٧، هەرچۆنێك بێت شکست و دۆڕانی بزووتنەوەکان و نەبوونی کیانێکی سیاسی بۆ مومارەسەی بیرو ڕاکانیان، نەبوویە هۆکاری دروستنەکردنی کاریگەری لە سەر دەوڵەت و خەڵکی چەوساوی ژێر دەستی دەوڵەت، هەر لەکاتی دروستبوونی ئەم پارتە سیاسی و مەزهەبییەوە و لە ئاکامی کێشە سەرەتاییەکانی دەوڵەتی خەلافەتدا، توانی ببێتە زەمینەیەك بۆ بەشخوراو و چەوساوەکانی دەوڵەت و کاریگەرییەکی تەواوی هەبوو لە درووستبون و فراوان بوونی بازنەکانی بەرهەڵستکاریە سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتیەکانی دژ بە سیاسەتی حەقیرانەی دەوڵەت١٨٨، ئەوەبوو شەپۆلەکانی ناڕەزایی بەردەوام فراوان و توند تر دەبوون١٨٩، بەشێوەیەك بە درێژایی سەردەمی ئومەوییەکان زیاد پەرەیان دەسەند، بەلام ئەو ناکۆکییەی لە بیروباوەڕە ڕەسەنەکانییانەوە پەیدا بوو، بەهۆی لاوازبوونی بزووتنەوەکەیان، چونکە ناکۆکی لە بنەما سەرەکیەکانی فیکریاندا ڕەنگدانەوەی لەسەر باریی سەربازی و سیاسییان هەبوو، هەر ئەمەش وایکرد لەو بارانەوە دژی یەکتری دەوەستان، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرجار دوو ئەمپرا تۆریەتی بە دەستەلاتی دنیای ئەو ڕۆژگارەیان دەهێنایە سەر چۆك، کە مەبەستمان ئومەوی و عەباسیەکانە١٩٠، بەلام پەرتەوازەیی گەورەترین

هۆكاری شكستو سیمای بزووتنەوەكانیان بوو، بە تایبەتی لە سەردەمی ئومەویەكاندا ئەم دیاردەیە بوو بە هاندەرێكی تری شكستیان، بەجۆرێك نەیانتوانی كەڵك لە پەرتەوازەیی ئومەویەكان وەربگرن، چونكە لە رۆژانی سەرەتادا هەموو دەوڵەت یەك بوو، بەلاَم ئومەویەكان دەمارگیریی عەرەبایەتییان سەرەتاكانی پەرتەوازەیی دیاری كرد، لێرەوە بانگەشەی عەلەویەكانو عەباسیەكانیش بەكاریگەر بەنەریتی دەمارگیرانەی ئومەویەكان بووبوونە هەڵگری تۆوی دووبەرەكی١٩١، بەجۆرێك لەسەردەمی عەباسیەكاندا دەركەوت چۆن بەر بوونە یەكتری، دەریشكەوت ئەو رۆژانەی شانبەشانی یەكتری لەسەنگەردا بوون بۆ رووخانی ئومەویەكان چەندە نیەتو نیازی تاریكیان دژ بەیەكتری حەشار دابوو.

ئێمە دەڵێین بزووتنەوەكانی كوردو خەواریج كاریگەرییو ئەنجامی خۆیان هەبوو، بەلاَم نەریتی پەرتەوازەیی كە كلتوری زاڵی دەوڵەتو سیاسەتی ئومەویەكان بوو گەورەیی كاریگەرییەكانی تەسككردەوە١٩٢، بەلاَم چەند هۆكارێك لەمومارەسەی سەرانی ئومەویدا كاریگەری كوردانو خەواریجیان بە بەردەوامیو زیندوویەتی دەهێشتەوە، لەوانەش دووركەوتنەوەی ئومەو یەكان بوو لەبیرووباوەڕەكانی ئیسلام، چونكە دووركەوتنەوە لەبنەماكانی ئیسلام هۆكارێكی سەرەكی بوو بۆ هەڵگەڕانەوەی گەلانو بانگەشەكردنەوەیان بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە١٩٣، ئەو ئیسلامەی لە سیاسەتی نەژادی بنەماڵە ئومەویدا و لە هەڵسوكەوت لەگەڵ عەرەب و ناعەرەبەكاندا هیچ ئەرزشێكی نەمابوو١٩٤، بەمجۆرە چالاكی خەواریجەكان لە كۆتایی سەردەمی ئومەوییەكانداو لە ناوچەكانی عێراقو سوریاو هەرێمی جەزیرەو خوراسانو هەرێمی چیاكاندا زەمینەیان بۆ ڕێكخستنەكانی عەلەوییو عەباسیەكانیش خۆشكرد١٩٥، ئەو ڕێكخستنانەی بەشێوەیەكی بەدەوام لە ناوچەكانی رۆژهەلاَتی خەلافەتدا بوونیان زیندوو رادەگیرا، بەمەش دەگەینە ئاكامێك كە خەواریجەكان و كورد نەخشێكی گەورەیان بۆ بەرژەوەندی عەباسییەكان كێشا١٩٦، ئەوانیش سیاسەتێكی ژیرانەیان بۆ ڕاكێشانی نەیارانی ئومەوی

گرتەبەر، کەچی لەدوایشدا هەمان ئاکامی ئومەویەکان بەسەر کوردوخەواریجدا شکایەوە، هەربۆیە کوردو خەواریج لە گەمەکانی ڕووخانی ئومەویەکاندا تەنها مەقاشی دەستی عەباسیەکان بوون، هەروەکو چۆن عەلەویە ئامۆزاکانیشیان کرابوون بەهەمان مەقاشی دەستی عەباسیەکان، ئیتر سەرئەنجامی بزووتنەوەکانی خەواریج ڕاستە سەرکوتکرانی هەموویانی بەدوادا هات، بەڵام دەوڵەتی خەلافەتیان لەبیری دوژمنە ڕاستەقینەکانیان بردەوە، بۆ خۆشیان هیچ سودێکی نەبوو، هەرچۆنێك بێت کاریگەرییان لەسەر ناوچە کوردیەکان بەجێ هێشتو بیری خەواریج وەك مەزهەبێك لە ڕیشەی خەڵکی ئەوێدا مایەوە، بەتایبەتی لە هەرێمی جەزیرەدا١٩٧، بە جۆرێك ئەو کوردانە لە سەردەمی عەباسیەکانیشدا بەشێوەیەکی بەرچاو لەو ناوچانەدا بزافی خەواریجییان زیندووکردەوەو بەگوڕێکی نوێو تێکۆشانێکی گەورەترەوە بەرەنگاری دەوڵەتی نوێبوونەوە١٩٨، چونکە بزووتنەوەکان تەنها شکست بە ڕاپەڕینەکانیان دەهات، ئەگەر نا بیری مەزهەبییان هەر لە دەروونی خەڵکی دەمایەوە١٩٩، کە ئەمەش لەگەڵ بچوکترین زەمینەدا خواستی سەرهەڵدانی دەهێنایەوە یادیان، ڕووخانی ئومەویەکانیش کە دوژمنی سەر سەختی خەواریجەکان بوو، یاریدەرێکی باش نەبوو بۆ زیاد بونی بیری خەواریج، چونکە خەواریجەکان خۆیان کردە قوربانی مراندنی ئومەویەکانو عەباسیەکان هاتنە سەر دەور، عەباسیەکانیش هەمان تێزیان بۆ خەواریجو بیرو بۆچونەکانیان هەبوو، چونکە لەو فەراغە سیاسیەی دەسەڵاتگرتنە دەستی عەباسیەکاندا هیچ بوارێك بۆ مومارەسەی سیاسی خەواریجەکان کەڵکی لێوەرنەگیرا، بەڵام خەواریج وەکو بیر هەر مانەوەو کوردانیش هەر کاریگەر بوون پێیان، هەر چەند کەوا کورد لە ڕیزەکانی عەباسیەکانیشدا لەخزمەتو بەکارهێناندا بوون، ئەوەتا لە کۆتایی سەردەمی ئومەویەکانیشدا تێڕوانینی شوێنێکی وەکو هەرێمی جەزیرە تێڕوانینێکی خەواریجیانە بوو، هەربۆیە سەرکوتکرانی بزووتنەوەکەیان ماوەیەکی کاتی بوو، بەڵکو بۆ دووەمجار لە سەردەمی عەباسیەکاندا لەساڵی ( ١٣٥ك/٧٥٢ز) دووبارە سەریان

هەڵدایــەوە٢...، ئەمــەش ئــەو گریمانەیــە دەســەلمێنێت کــە ئومەویــەکان نــەیانتوانی ڕۆحــی خــەواریج لــەنێو نفوســی خەڵکدا بکــوژن، بــەلاّم توانیــان سەرهەڵدانەکانو سەرکردەکانیان بکوژن، چونکە ئەم بیروباوەڕە بەشێوەیەکی نهێنی لە ناو خەڵکدا هەر مابوو، کەواتە هەڵەیە وا بزانرێت لە سەردەمی دواین خەلیفــەی ئومەوییــدا بزووتنــەوەکانی خــەواریج کۆتاییــان هــات٢,١، بــەڵکو کاریگەرییەکانی ئەو هێزە بوو دەوڵەتی خەلافەتی لە ڕۆژهەلاّت بێ ئاگا کـردوو فرسەتی دەوڵەتێکی تری هێنایە گۆڕێ، هەروەك چۆن خاوەنی (الاخبار الدولة العباسـية) دەڵـێ : دەرکـەوتنی بانگـەوازی عەباسـییەکان بـە هـۆی سـەرقاڵی مەروان بوو بە جەنگی خەواریجەوە، کە هەریەك لەزوحاكو شـەیبان ڕۆڵییـان بینــی تیایــدا: ٢,٢، کەواتــە ڕاســتە ئومەویــەکان کۆتاییــان بەڕاپەڕینــەکانی خــەواریج هێنــا بــۆ ماوەیــەکی کــاتی، بــەلاّم ئــەو هەوڵــەیان لەسـەر حـسابی ڕووخانی خۆیان بوو.

ئەوەی لەم ئەنجامەدا گرنگ بێت ئەوەیە، کــە خەواریجــەکان هێزێکــی تریــان هێنایــە ســەرکار کــە دوژمنانــەتر لــە بــیرو بــاوەڕوو پــرۆژە دیموکراتییــەکانیان دەیروانــی٢,٣، ئــەوەتا یەکــەم کاردانــەوەی ئــەم دوژمنایەتییــەش لەســاڵی (١٣٥ك/٧٥٢ز)دا بە هەڵگیرسانی ڕاپەڕینی نوێ لە جەزیرەدا بوو٢,٤، دیارە ڕوزەی ئەو کاردانەوەش دیسانەوە کوردەکـان بـوون، بـەلاّم ئـەمجارەیان وەك چــۆن خوێنرێــژی و بێــدادی گــەلانی ناعــەرەب بــوو بــەهۆی لــە ناوچــوونی ئومەویــەکان و ســتەمکاریەتیان لــە مێــژوودا ســڕرایەوە، کەچــی ئــەمجارەیان هێــزی خەواریجــەکان و کاردانــەوەکانیان نــەیانتوانی ئــەو قــەلاّی ســتەمە بڕووخێنن٢,٥، کە خۆیان بنیادیان نابوو، کوردیش ئیتر لەو سەردەمەدا ملیـان دا بـۆ چـەندین میرنـشینی دروسـتکراوی ژێـر کـەیفی عەباسـیەکانو پـرۆژەی دژایەتی کردنی دەوڵەتو پشگیریکردنی خـەواریجیان کـاڵتر کـردەوە، ئەمـەش هۆکـارێکی لــە نێوچــونو نــەبوونی کیــانێکی سیاســی بــوو بــۆ خــەواریجو شوێنەوتوانی باوەڕکانیـان بەدرێـژایی حوکـومڕانی دەسـتەلاّتەکانی خەلافـەتی ئیسلامی.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

١. مردوخ ايت الله محمد: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٨٧.
٢. منصور مخدوم: اهميت كردو كردستان در ادوار تاريخى ايران، كتابخانه ملى، تهران، چاپ ١٣٨٢،لا٦٨٧.
٣. البلاذري: فتوح البلدان،ج١، لا٢٣٤.
٤. سەرهەنگ عەبدولواحد: کوردو نیشتمانەکەیان،وەرگێرانی بۆ فارسی سەلاحەدین عەباس،چاپی یەکەم،٢٠٠٠،لا٤١.
حەسەن ئەرفەغ: کوردەکان لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسی، وەرگێرانی سەردار محمد، سلیمانی، ٢٠٠٠، لا١٨.
فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١١..
*بەرهەڵستکاریەکانی کورد دژی خەلافەتی ئومەوی لە باسەکانی تردا لێیان دەدوێین، لەم بەشەدا تەنها ڕووی هاریکاری کوردو دەوڵەتی خەلافەت دەخەینە ڕوو.
* الخزر: هۆزێکی گەورەی بەڕەچەڵەك تورکمان بوون، ولایەتەکەیان دەکەوتە پشتی ( باب الابواب)، بڕوانە : ( القزوینی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٨٤).
٧. فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٣.
* الوهرانی بریتییە لە نازناوی الشیخ رکن الدین محمد بن محمد( ت ٥٧٥ك/ ١١٧٩م )، خاوەنی منامات الوهرانی و مقاماته ورسائله.
* یەزیدی کوڕی موعاویە کە ( ابو خالد الاموی) یشیان پێدەوت، لە ساڵی ٢٦ك لەدایك بووە، کوڕی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانەو لە پاش بابی ساڵی( ٦١ — ٦٤ )ك حوکومڕانی دەوڵەتی ئومەویەکانی کردووە بڕوانە : ( السیوطی : تاریخ الخلفا، لا٢٢٤) .
٨. وەرگیراوە لە فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١٢٧.
٩. یاقوت الحموی: سەرچاوەی پێشوو،ج٢، لا٣٧٥.
١٠. ابن القيم: الامامة والسياسة، ط٣، مطبعة مصطفى البابى، ١٩٦٣،لا ١٣٩.
* ئالودەبوونی کوردان بەبۆچونی هەندێك لە مێژوونوسان بۆ ئەم خەلیفەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە دایکی کورد بووەو هەروەها لە سەردەمی والیەتیشیدا لە جەزیرە بەتێکەڵی کۆمەلایەتیو ئاکاری سیاسیانەی لەگەڵ کوردان ڕاهاتووە، چونکە پێش بوون بە خەلیفە لە جەزیرەو ئەرمینیادا والی بووە ( ابن الکپیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٥، لا ٤٦" محمد امین زکی: کوردو کوردستان، لا ١٢٧).

١١. فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢٨.
١٢.مەردوخی: سەرچاوەی پێشوو، لا١٢٧
١٣. فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١٢٨.
١٤. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ١٦٥.
* هەکاری شارێکی کورد نشینی سەر بەهەرێمی جەزیرەیەو سەر بەشارەکانی موسڵی ئەو سەردەمە بووە ( فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٠ ).
*جۆلەمێرگ شارێکە لە باشوری هەکاریدا :( شوان عوسمان: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٠).
١٥. سعید الدیوەچی: الیزیدیە، دارالکتب، الموصل، ١٩٨٢،لا ٨٦.
١٦. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ٢٩
١٧. زرین کوب سەرچاوەی پێشوو، لا١,٥٧.
١٨. منصور مخدوم: سەرچاوەی پێشوو، لا٦٨.
* حولوان شارێکی گەورەی کورد نشین بووە، دەکەوێتە هەرێمی چیاکانەوەو سنوری ئەم هەرێمە لە عێراق جیادەکاتەوە، ئەم شارە لە پاش جەلەولا فەتح کراوە: (یاقوت الحموی : سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٩٠).
* ماسبزان شارێکی کوردنشینی سەربەهەرێمی چیاکانەو دەکەوێتە نزیك سیروانەوە شوان عوسمان مستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا٦٦).
* موترەفی کوڕی موغەیرەی شوعبە یەکێك بوو لە سەردارانی بزووتنەوەی خەواریج لە سەردەمی خەلیفە عەبدولمەلیکی کوڕی مەرواندا، ئەم سەرکردەیەی خەواریج جاری واهەبووە ڕۆژئاوای هەرێمی چیاکانی لەژێر دەستدا بووە، کەناوچەیەکی کورد نشینە، موترەف یەکێك بوو لە کوڕانی موغەیرە، ئەوانەی حەجاج بۆ ئەوەی پێگەی بەرزی باوکیان بەزیندویی ڕابگرێت هەمویانی کردە بەرپرسی شارەکانی ژێر حوکمڕانی خۆی، بەتایبەتی کردنیە بەرپرسی مەدائینو هەمەزان، بەڵام موترەف لەگەڵ زیادبوونی هەیمەنەو بزووتنەوەی خەواریج پەیوەندی لەتەك حەجاج تێك دەچێتو پەیوەندی دەکات بەبزووتنەوەی خەواریجەوە، لەدوایشدا دەرکەوت کە پەیوەندی لەتەك شەبیبی خەواریجدا هەبووە : ( ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٢٦٠)
١٩. ابن الاثیر سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٦٣.
* هەمەدان شارێکی زۆر کۆنەو دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی هەرێمی چیاکانەوە: ( الاصطخری سەرچاوەی پێشوو، لا١١٠).
٢٠. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٦٣
٢١. منصور مخدوم ك سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٨.

*خەریتی کوڕی ڕاشید پێناسێکی ئاینیو فیکری دیاریکراوی نەبوو، زۆرجار هاریکاری خەلافەتی دەکردوو دواجاریش لێی یاخی دەبوو، لە کۆتایشدا وەکو سەردارێکی خەواریج دەرکەوت ( نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢.)، هەروەها مەسعودی دەڵێ ڕاشید لەتەک ٣٠٠لەشوێنکەوتوانی دەبنە مەسیحی: (المسعودی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤,٨)

٢٢. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ٦٥

* زیاد بن ابیە ناوی بابی نەناسراوە بۆیە بە کوڕی بابی ناسرابوو، دایکی ناوی سومەیە بوو، هەروەها بە زیادی کوڕی ئەبو سوفیان ناوی هاتووە، لەساڵی ٤٥ك بووەتە والی بەسرە، لەساڵی ٥٣ك کۆچی دوایی کردووە: ( ابن الکثیر سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ٣١٥).

٢٣. ابن الکثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ٣١٥.

* رامهرمز شارێکە لە شارەکانی هەرێمی ئەهواز و کوردی تیا دەژی ( شوان عوسمان موستەفا: سەرچاوەی پێشوو، لا ٧٢ ).

٢٤. نایف معروف : سەرچاوەی پێشوو، لا ١,١.

* خەراج بریتیە لەو سیستەمە ئابوریەی کە دەوڵەتی خەلافەت بەسەر زەویە کشتوکاڵیەکاندا جێبەجێی دەکرد ( طارق حەسەن هەمەوەندی: پوختەی فیقهی شەریعەت بەبەڵگەی قورئانو سوننەت، لا ٣٤١).

٢٥. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ١,١.

٢٦. ابن الکثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٣١٦,٧

٢٧. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا ١,١.

٢٨. منصور مخدوم: سەرچاوەی پێشوو، لا٦٨.

* سەبارەت بەبڵاوبوونەوەی ئاڕاستەکانی خەواریج لە دووای جەنگی نەهرەوان، بڕوانە نەخشەی پاشکۆی ژمارە ١.

٢٩. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ١٨٧.

٣٠. فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا ١,٨.

٣١. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ١٨٧.

٣٢. لطیفة البکاوی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٣.

٣٣. البلاذری : انساب الاشراف، ج٢، لا ٤٨٢.

٣٤. هەمان سەرچاوە، ج٢، لا ٤٨٢.

٣٥. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا١٨٧.

٣٦. لگیفە البکاوی: هەمان سەرچاوە، لا ٥٣.

٣٧. هەمان سەرچاوە، لا ٥٢.
٣٨. لطيفة البكاوى   سەرچاوەى پێشوو، لا ٥٣.
٣٩. البلاذرى: سەرچاوەى پێشوو، ج٢، لا ٤٨٢.
* بندنجين (مەندەلى ) شارێكى كۆنى ناسراوە لە نزيك نەهرەوانداية: ( ياقوت الحموى : سەرچاوەى پێشوو، ج٢، لا ٤٩٩ ).
٤٠. ابن الاپير : سەرچاوەى پێشوو، لا ج٤، لا ١٨٧.
٤١. ابن جياط : تاريخ خليفه، ج٢، لا ١٨١.
٤٢. لگيفه البكاوى : سەرچاوەى پێشوو، لا ٥٤.
٤٣. ابن الاپير : سەرچاوەى پێشوو، ج ٣، لا ١٨٧.
* سەبارەت بەم بزووتنەوەيە سەرچاوەكان هيچ زانياريەكيان نەداوە.
٤٤. لطيفة البكاوى: سەرچاوەى پێشوو، لا ٥٣.
٤٥. هەمان سەرچاوە، لا ٦٢.
ـ دارا شارێكە دەكەوێتە نێوان ماردينو جەزيرەوە: ( ياقوت الحموى : ج٢، لا ٤١٨ ).
٤٦. الدينورى : الاخبار الطوال، لا ١٥٤.
* فروەى كوڕى نەوفەل لە ديارترين سەركردەكانى خەواريجە لە دواى جەنگى نەهرەوان لە تەك ٥.. لە شوێنكەوتوانى لە عەبدوللاّ جيادەبنەوەو ڕودەكەنە مەندەلى : ( الدينورى : سەرچاوەى پێشوو، لا٢١. )
٤٧. هەمان سەرچاوە، لا ٢١..
٤٨. ابن الاثير : سەرچاوەى پێشوو، ج٣، لا ١٩٧.
٤٩. الطبرى : سەرچاوەى پێشوو، ج٥، لا ٣٢.
٥.. هەمان سەرچاوە، ج٥، لا ٨٦.
٥١. احمد ميرزا: سەرچاوەى پێشوو، لا ١٥.
* حولوان شارێكى گەورەى كۆنە دەكەوێتە سنورى هەرێمى چياكانەوە،
٥٢. الدينورى: سەرچاوەى پێشوو، لا ٢١..
٥٣. هەمان سەرچاوە،. ٢١.
٥٤. هەمان سەرچاوە، ٢١..
٥٥. محمد امين زكى: تاريخ السليمانيه، بغداد، ١٩٥٩، لا٣١.
٥٦. ابن الاثير: سەرچاوەى پێشوو، ج٢، لا ٤,٩.
٥٧.اليعقوبى: سەرچاوەى پێشوو، ج٢، ٢١٧.
٥٨. هەمان سەرچاوە، ج٢، لا ١٩٣.
٥٩. ابن الاپير : سەرچاوەى پێشوو، لا ج٣، ٤١..

٦٠. هەمان سەرچاوە، ج٣، لا ٤١..
٦١. الطبری : سەرچاوەی پێشوو، ج٥، لا ١٦٦.
٦٢. ئارشناك پۆلادیان: كورد لە سەرچاوە عەرەبیەكاندا، لا ٤٢.
٦٣. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، لا ٢,٦.
٦٤. ئارشناك : سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٣.
٦٥. لطیفة البكاوی : سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٨.
٦٦. كامەران بابازادە: كوردو نەتەوەو ئیسلام، گۆڤاری ڕابوون، ژ٣، سلیمانی، ١٩٩٩، لا٥٣٦.
٦٧. احمد میرزا : لا ١١٦.
٦٨. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ٢٢٤.
* ماه الكوفه ( الدینور ) یەكێك بووە لە پایتەختە دێرینەكانی ساسانیەكان، لەم دەڤەرەدا دوو پایتەخت هەبووە، كەبریتی بوون لە كرماشان‌و دەینەوەر، كە هەردووكیان دەكەونە هەرێمی كوردنشینی چیاكانەوە: (شوان موستەفا عوسمان سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٨) .
* ماه البصره ( نهاوند ) ئەم ناوە هەموو شارەكانی نەهاوەند لە هەرێمی چیاكان‌و بروجرد لە لورستان دەگرێتەوە : ( هەمان سەرچاوە، لا ٥٦ )
٦٩ . احمد میرزا : سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٦.
٧٠.. الخربوطلی : سەرچاوەی پێشوو، لا ١٣..
*حیان بن چیبان سلمی یەكێكە لە سەركردە یەكەمینەكانی خەواریج كە لەماوەی فەرمانڕەوایەتی ئومەویەكاندا سەركردایەتی سەرهەڵدانەكانی كوردووە ( فاروق عمر : تاریخ الخلیج العربی فی العصور الاسلامیه، لا ١,١ ) .
* ڕەی ئەم شارە بەدایكی وڵاتەكان بەنێوبانگەو لە بەرزترین شارەكانی هەرێمی چیاكانە : ( یاقوت الحموی : سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ١١٦ ) .
٧١ . نایف معروف : سەرچاوەی پێشوو، لا ١٢..
٧٢. الطبری : سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ١٨١.
*عەبدولمەلیكی كوڕی مەروان كوڕی ئەبو عاصی نەوەی ئومەیەیە، ساڵی ٢٦ك لەدایك بووە، هەر لە سەردەمی خەلافەتی بابیدا كراوە بە وەلی عەهد، لەسەردەمی خەلافەتی خۆیشیدا وولآت پشێوی‌و نائارامی دایگرتبویەوە: (السیوگی سەرچاوەی پێشوو،٢٣٧).
٧٣. ابن الاثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٣٩٤
٧٤. سعید الدیوچی: تاریخ الموصل، المكتبه الوگنیه ببغداد، بغداد، ١٩٨٢، ج١، لا٤٦.

* سەفاریەکان گروپێکی تایبەتی خەواریجن‌و خاوەنی بیروباوەڕی جیاوازن لەوانی تر، ناوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ زیادی کوڕی ئەسفەر، یاخو هەندێك پێیان وایە ناوەکەیان لەوەوە هاتووە کە گوایا لەبەندایەتیدا زەرد بووبوون:(البغدادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٧٧.)
٧٥. ابن کثیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٨، لا ١٢.
٧٦. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٣.
٧٧. الطبری : سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا٢١٥.
٧٨.لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٤.
٧٩. سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٦.
٨٠. هەمان سەرچاوە، لا ٤٨.
٨١. الطبری: : سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا٢١٦.
٨٢. هەمان سەرچاوە، ج٦، لا٢١٦.
٨٣. لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٨٥.
٨٤. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ٢١٨.
٨٥. لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٨٦.
٨٦. ابن الاثیر: : سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٤٢.
*المدبج: گوندێکە لەنێوان موسڵ‌و عێراقی عەرەبیدایە:(یاقوت الحموی: سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا٤١٥ ).
٨٧. سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، ج١، لا٤٧.
٨٨. لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٩.
٨٩. ئارشناك بالادیان: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٦.
* دسکرە : شارێکی زۆر دێرینەو لە ڕەشەخاکی عێراقدایە : ( الاصطخری: سەرچاوەی پێشوو، لا٨٥ ).
٩٠. ابن الاپیر : سەرچاوەی پێشوو،ج ٩، لا ١٠.
٩١. الیعقوبی: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٧٤.
٩٢. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ١٣٢.
٩٣. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٤.
٩٤. ابن الاپیر : سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ٨١.
٩٥. محمد جەمیل ڕۆژ بەیانی: خانەقین لە مێژوودا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، بەرگی ١٨_ ١٩، بغداد، ١٩٨٨،لا ٢٣٤.
٩٦.الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٦، لا ٢٢٥.
٩٧. ابن الاثیر: سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٦٠— ٦١.
٩٨. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٨.
٩٩. کارل بروکلمان: سەرچاوەی پێشوو، لا١٤٤.

*ڕەچەڵەکی مەسیحیەکانو بڵاوکردنەوەی ئەو ئایینە دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی یەکەمو سەدەی دووەمی زایینی، بەتایبەتی لە ڕۆژهەلاتی دیجلەو شاری هەولێر و هەرێمی جەزیرەدا: (شوان موستەفا عوسمان: سەرچاوەی پێشوو، لا١١٧ ).

١٠٠. موصلح موستەفا جەلال : سەرچاوەی پێشوو، لا١٨١.

١٠١. لگیفە البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢١..

* بەهلول ناسرابوو بە ( الکثارة)، سەرکردەیەك بوو لەهۆزی شەیبانی عەرەبی کە لە موسڵ نیشتەجێبوو بوو: ( سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٩).

١٠٢. لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢١..

١٠٣. علی حسن خربوگلی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢,٤.

١٠٤. سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، ج١، ٤٩.

١٠٦. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، لا١٣٢.

١٠٥. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا١٣.“ ابن خلدون: سەرچاوەی پێشوو، ج٣، ١٦٣.

١٠٦. سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٩.

١٠٧. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٧، لا ١٣٢.

* کحیل شارێکە دەکەوێتە سەر ڕوباری دیجلە، لەنێوان هەردو زێدایەو دەکەوێتە سەرووی تکریتەوە، ئێستا شوێنەواری نەماوە.

١٠٨. سعید الدیوچی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٩.

١٠٩. وەرگیراوە لە فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٤.

*کفرتوثا شارێکی گەورەی جەزیرەیە دەکەوێتە نێوان داراو راس العین.

١١٠. خلیفە بن خیاگ: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٦٣.

١١١. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٣.

سەعدی کوڕی مەجدەل: ئەم سەرکردەیەی خەواریجیش لە هۆزی شەیبان بوو : ( عدنان علی الخراجی: حرکات المعارضة للخلافە الامویة، ط١، مطبعة الاشعا، لا٥٤).

١١٢. ابن کپیر: سەرچاوەی پێشوو، ج١.، لا ٢٥.

١١٣. ابن خلدون: سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا١٦٤.

١١١. لطیفة البکاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢,٩.

١١٤. هەمان سەرچاوە، لا٢٥٩.

١١٥. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٦٣.

١١٦. خلیفە بن خیاط: سەرچاوەی پێشوو،ج٢، لا ٢٩..

١١٧.محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٦٤.

١١٨. هەمان سەرچاوە، لا٤٦٤.

١١٩. خليفه بن خياط: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٧٢.
١٢. ابن كثير: سەرچاوەی پێشوو، ج٣، لا ٢٥.
● بەستام لەخەواریجە بەیهەسیەکان بوو، سەرداری هۆزی گەورەی ڕەبیعەش بوو.
١٢١. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٦٧.
١٢٢. هەمان سەرچاوە، لا٤٦٨.
١٢٣. لطيفة البكاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٩.
١٢٤. البلاذری: سەرچاوەی پێشوو، ج٨، لا ٨.
١٢٥. خليفه بن خياگ: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٣٨١.
١٢٦. الخربوطلی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢,٥.
١٢٧. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٧١.
* هەندێك لە سەرچاوەكان دەڵێن بەستام لەلایەن زوحاك كوژراوە، لەوانە :( خليفه بن خياط: سەرچاوەی پێشوو، لا٣٨٢ ).
١٢٨. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٩.
١٢٩. زرار صديق توفيق: سەرچاوەی پێشوو، لا٩٤.
١٣٠. المسعودی : سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ١٣٥.
١٣١. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٥٩٩.
١٣٢. هەمان سەرچاوە، لا٥٩.
١٣٣. لطيفة البكاوی: سەرچاوەی پێشوو، لا٢٥٨.
١٣٤. احمد شلبی: التاريخ الاسلامی والحضارة الاسلامية، ط١، مكتبة النهضة، القاهرة، ١٩٦١، لا ٢٩.
* زوحاك لەبنەماڵەی ڕەبیعەیەو ناوی تەواوی بریتییە لە زوحاكی كوڕی یەزیدی كوڕی قەیسی كوڕی عەوری كوڕی حسێنی كوڕی عەبدوڵڵایە لەنەوەی سەعلەبە ( محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٧٢).
١٣٥. هەمان سەرچاوە، لا ٤٧٣.
١٣٦. عبد اللطيف عوده واخرون: مختصر تاريخ الاسلام، لا٨٧.
١٣٧. البلاذری: سەرچاوەی پێشوو، ج٨، لا ٨.
١٣٨. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا ٥٧.
١٣٩. هەمان سەرچاوە، ج٩، لا٥٧.
١٤..محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٤٧٤.
١٤١. عبد اللطيف عوده واخرون: سەرچاوەی پێشوو، لا٧٨.
١٤٢. نيكيتا ايليسيف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٥.

١٤٣. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا ٥٧.
١٤٤.ابن حلدون: سەرچاوەی پێشوو،ج٣، لا ١٦٥.
١٤٥. ابن الاثير: سەرچاوەی پێشوو، ج٥، لا ٣٤٩.
١٤٦. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج٧،لا ٣١٧.
١٤٧. محمد جاسم حمادي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٧٥.
١٤٨. لطيفة البكاوي: سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦١.
١٤٩. خليفه بن خياط: سەرچاوەی پێشوو، ج٢،لا ٣٥٨.
١٥٠. هەمان سەرچاوە، ج٢، لا٤,٤٤.
١٥١. ئارشناك: هەمان سەرچاوە، ٥٢.
١٥٢. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا ٥٧.
١٥٣. البلاذري: سەرچاوەی پێشوو، ج٨، لا ٩.
١٥٤. لطيفة البكاوي: سەرچاوەی پێشوو، لا٢٦٥.
١٥٥. فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١١٧.
١٥٦. هەمان سەرچاوە، لا١١٧.
١٥٧. محمد جاسم حمادي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٠٠.
١٥٨. لطيفة البكاوي: سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٦٨.
١٥٩. نيكيتا ايليسيف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٥.
١٦٠. لطيفة البكاوي:سەرچاوەی پێشوو،لا ٢٦٨.
١٦١.احمدميرزا: سەرچاوەی پێشوو، لا١٢١.
١٦٢. محمد جاسم حمادي: سەرچاوەی پێشوو، لا,٤٥٩
١٦٣. هەمان سەرچاوە، لا٤٦٢.
١٦٤. ابن حوقل: سەرچاوەی پێشوو، لا٢,٣.
١٦٥.احمد ميرزا: سەرچاوەی پێشوو، لا١٢١.
١٦٦.الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا٨٣.
١٦٧. ابن الاثير: سەرچاوەی پێشوو، ج٤، لا ٢٩٨.
١٦٨. فائزه محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا١١٨.
١٦٩. الازدي: تاريخ الموصل، تحقيق د. علي حبيبه، دارالتحرير، القاهره، ١٩٦٧، لا ٧٢.
١٧٠. الطبري: سەرچاوەی پێشوو، ج٩،لا ٨٣.
١٧١. محمد جاسم حمادي: سەرچاوەی پێشوو، لا ١١٨.
١٧٢. الازدي: سەرچاوەی پێشوو، لا٧٤.
١٧٣. ابن الاپير: سەرچاوەی پێشوو، ج١٠، لا ٢٩.
١٧٤. هەمان سەرچاوە، ج١٠، لا ٣٠.

١٧٥ الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا ٨٢.
١٧٦. خلیفە بن خیاگ: سەرچاوەی پێشوو، ج٢، لا ٢٩.
١٧٧. الطبری: سەرچاوەی پێشوو، ج٩، لا٨٢.
١٧٨ فائزە محمد عزت: سەرچاوەی پێشوو، لا ١٨.
١٧٩. الازدی: سةرضاوةی پێشوو، لا٧٤– ٧٥.
١٨٠. فاروق عمر: گبیعە الدولە العباسیە، گ١، بیروت، ١٩٧٠، لا١٨٢.
١٨١. زرار صدیق زرار: سەرچاوەی پێشوو، لا٩٣.
١٨٢. هەمان سەرچاوە، لا ٩٤.
١٨٣. حسام الدین علی غالب النقشبندی: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٦.
١٨٤. زرار صدیق توفیق: سەرچاوەی پێشوو، لا٩٤.
١٨٥. المسعودی: سەرچاوەی پێشوو،ج٢، لا ١٢٥.
١٨٦. عبدالله حماد: سەرچاوەی پێشوو، لا ٤٢.
١٨٧. صائب عبدالحمید: سەرچاوەی پێشوو، لا٧٣٢.
١٨٨. مصلح مستەفا جەلالی: سەرچاوەی پێشوو، لا١٣..
١٨٩. هەمان سەرچاوە، ١٣١.
١٩٠. عزیز العظمە: سەرچاوەی پێشوو، لا١٦٣.
١٩١.هەمان سەرچاوە، لا١٦٣.
١٩٢. نیکیتا ایلیسیف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٩١.
١٩٣. هەمان سەرچاوە، ,١٩٢
١٩٤. عبد الحسین زرین کوب: دوقرن سکوت، لا ١,٢.
١٩٥. نیکیتا ایلیسیف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٩١.
١٩٦. ئارشناك بولادیان: سەرچاوەی پێشوو، لا٥٣.
١٩٧. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٥٩٩.
١٩٨. زرار صدیق توفیق: سەرچاوەی پێشوو، لا٩٥.
١٩٩. محمد جاسم حمادی: سەرچاوەی پێشوو، لا٥٩٩.
٢٠٠. هەمان سەرچاوە، لا٥٢٩.
٢٠١. هەمان سەرچاوە، لا ٥٣٠.
٢٠٢. هەمان سەرچاوە، لا٥٣١.
٢٠٣. هەمان سەرچاوە، لا ٥٣٠.
٢٠٣. نایف معروف: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٣.
٢٠٤. عبد الحسین زرین کوب: سەرچاوەی پێشوو، لا١٨٣.

# لیستی سەرچاوەکان

## یەکەم   سەرچاوە ڕەسەنەکان

قورئانی پیرۆز.


١. ابن الاثیر: عزالدین ابوالحسن علی بن ابی الکرم الشیبانی(ت ٦٣٠ه/ ١٢٣٢م).

٢. الکامل فی التاریخ، دار احیا التراث العربی، ط١، تحقیق المکتبة التراث، بیروت لبنان، ١٤,٨ ه/ ١٩٨٩ م.

٣. الازدی: ابو زکریا بن محمد بن ایاس ( ت٣٣٤ه/ ٩٤٥م).

٤. تاریخ الموصل، تحقیق الدکتورعلی حبیبة، دار التحریر، القاهرة، ١٩٨٧.

٥. الاسفراینی: ابو المظفر (ت ٤٧١ه/ ١,٧٨).

٦ التبصیر فی الدین، تحقیق زاهد بن الحسن الکوثری، مکتبة الخانجی، مصر ١٩٥٥.

٧. الاصطخری: ابو اسحاق محمد بن ابراهیم الفارسی ( ت٣٤١/ ٩٥٢م).

٨. المسالك والممالك، تحقیق محمد جابر عبد العال الحسینی، دار الصادر بیروت، ١٩٦١م.

٩. البخاری: ابو عبداللة محمد بن اسماعیل (ت ٢٥٦ه/ ٨٧٠م)

١٠. صحیح البخاری، شرح ابن الحجر، بغداد، ١٩٨٦.

١١. البدلیسی   الامیر شرفخان ( ١٠٠٥ه/ ١٥٩٦).

١٢. شرفنامة، وەرطێرانی هەذاری موکریانی، نجف، ١٩٧٢.

١٣. البغدادی: عبدالقاهر بن طاهر( ت ٤٢٩ه/ ١,٣٧م).

١٤. الفرق بین الفرق، ط٢، بیروت، ١٩٧٧.

١٥. البلاذری: ابوالعباس بن یحیی بن جابر( ت ٢٧٩ه، ٨٩٢م).

١٦. انساب الاشراف.

١٧.فتوح البلدان، مراجعة والتعليف، رضوان محمد،دارالكتب العلمية، بيروت، ١٩٧٨.
١٨.ابن تيمية: شيخ الاسلام تقى الدين احمد بن تيمية الرانى ( ت ٧٢٨هـ).
١٩.الوصية الكبرى، تحقيق على حسن على.
٢٠. ابن الجوزى: جمال الدين ابن الفرج عبدالرحمن البغدادى.
٢١.تبليس ابليس، مطبعة اوفيست الوسام، بغداد، ١٩٨٣.
٢٢.ابن حوقل: ابو القاسم محمد بن على النصيبى ( ت٣٦٧هـ/ ٩٧٨م).
٢٣.صورة الارض، دار مكتبة الحياة، بيروت، ١٩٧٩.
٢٤.ابن خلدون: عبدالرحمن بن محمد المغريبى ( ٨,٨هـ، ١٤,٨م).
٢٥.المقدمة، دار الكتاب المصرى، والكتاب البنانى، القاهرة، بيروت، ١٩٩٩.
٢٦. تاريخ ابن خلدون، المعروف ب _ العبر والديوان المبتدا والخبر، موسسة جمال للطباعة والنشر، بيروت لبنان، ١٩٧٨.
٢٧. ابن خياط: ابو عمر خليفة بن خياط بن ابى هوبيرقو ( ٢٤.هـ/ ٨٥٤م).
٢٨. تاريخ خليفة بن خياط، تحقيق اكرم ضيا العمرى، ط٢، دار القلم، ١٩٧٧.
٢٩. الدينورى : ابو حنيفة احمد بن داود_ ت ٢٨٢/ ٨٩٥م).
٣٠.اخبار الطوال، تحقيق عبد المنعم، ط١، دار الاحيا الكتب العربية، القاهرة، ١٩٦..
٣١.الزمخشرى: الامام جار اللة محمود بن عمر ابو القاسم( ت ٥٣٨).
٣٢.الفائق فى غريب الحديث، دار الاحيا الكتب العربية، القاهرة، بدون التاريخ.
٣٣. السيوطى: جلال الدين عبد الرحمن، ( ت ٩١١هـ/ ١٥,٥م).
٣٤.تاريخ الخلفا، تحقيق شيخ قاسم الشماعى، الرفاعى، ط١، دارالقلم، بيروت لبنان، ١٩٨٦.
٣٥.الشهرستانى: ابو الفتح محمد بن عبد الكريم،( ٤٨٥هـ/ ١١٥٣م).
٣٦. الملل والنحل، ط٧، بيروت، ١٩٩٨.
٣٧. الطبرى: ابى جعفر محمد بن جرير الطبرى ( ت ٣١.هـ/ ٩٢م)

٣٨. تاريخ الرسل والملوك، تحقيق ابو الفضل ابراهيم،ط٢، دار المعارف، القاهرة، ١٩٦٩.
٣٩.ابن العربى: القاضى ابو بكر بن العربى محمد بن عبداللة.
٤٠. العواصم من القواصم، تحقيق محمد الدين الخطيب، بيروت، ١٩٧٨.
٤١. ابن الفقيه: ابو بكراحمد بن ابراهيم الهمدانى ( ت ٢٩٠هـ/ ٩,٢م).
٤٢. مختصر كتاب البلدان، مطبعة بريل، ليدن.
٤٣.ابن قتيبة: زكريا بن محمد بن محمود،( ت ٦٨٢هـ).
٤٤. الامامة والسياسة، ط٢، مطبعة مسطفى البابى، ١٩٦٣م.
٤٥. القزوينى: زكريا بن محمد بن محمود( ت ٦٨٢هـ/ ١٢٨٣م).
٤٦.اثار البلاد واخبار العباد، دار الصاد بيروت، ١٩٦٠م.
٤٧. ابن كثير: عماد الدين ابو الفدا اسماعيل( ٧٧٤هـ/ ١٣٧٣م).
٤٨. البداية والنهاية فى التاريخ، ط١، دار المعرف، بيروت، ١٩٦٦.
٤٩. المسعودى: ابو الحسن على بن حسين بن على( ت٣٤٦هـ/ ٩٥٦م).
٥٠. مروج الذهب ومعادن الجوهر، مطبعة دار الاندلس بيروت.
٥١. مسلم بن الحاج القشيرى.
٥٢. الجامع الصحيح ( صحيح المسلم).
٥٣.ياقوت الحموى: شهاب الدين بن عبد اللة الرومى بغدادى( ت ٦٢٦هـ/١٢٢٨م)
٥٤. معجم البلدان، دار صادربيروت، ( دون تاريخ).
٥٥. اليعقوبى احمد بن ابى يعقوب ( ت ٢٩٢هـ/ ٩,٤م).
٥٦. تاريخ اليعقوبى، دار صاد ر ببيروت، ١٩٦٠.
٥٧. العسلانى: احمد بن على بن محمد بن الكتانى العسلانى معروف بابن حجر.
٥٨. صحيح البخارى: شرح فتح البارى، دارالفكلر، بيروت، ٢٠٠٠.

دووەم : سەرچاوە عەرەبیە نوێیەکان.

٥٩. ابراهيم حركات.
٦٠. ٣٣. المجتمع الاسلامى والسلطة فى العصر الوسيط، دار الَبيضا، ١٩٩٨.
٦١. احمد امين.
٦٢. ٣٤. فجر الاسلام، بحث عن حياة العقلية فى صدر الاسلام الى اخر الدولة الاموية، بيروت، ١٩٦٩.
٦٣. احمد ميرزا.
٦٤. غربى اقليم الجبال فى صدر الاسلام، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٤.
٦٥. احمد شلبى.
٦٦. التاريخ الاسلامى والحضارة الاسلامية، القاهرة، ١٩٧٥.
٦٧. بروكلمان: كارل.
٦٨. تاريخ الشعوب الاسلامية، ط٢، بيروت، ١٩٧٩.
٦٩. بندلى جوزى.
٧٠. من تاريخ الحركات الاسلامية فى الاسلام، دار الروائع، بيروت لبنان، دون تاريخ.
٧١. تقى الدباغ.
٧٢. الفكر الدينى القديم، ط١، بغداد، ١٩٩٠.
٧٣. جمال رشيد احمد ( الدكتور )ز
٧٤. تاريخ الكرد القديم، دار الحكمة للطباعة والنشر، اربيا، ١٩٠.
٧٥. حسن ابراهيم حسن.
٧٦. تاريخ الاسلام السياسى والدينى والثقافى والاجتماعى. دارالجيل، بيروت، ١٩٩٦.
٧٧. حسين الشاكرى.
٧٨. نشوء المذاهب والفرق الاسلامية، ط١، ايران، ١٤١٨ه.
٧٩. عبد الجواد ياسين.
٨٠. السلطة فى الاسلام، ١٩٨٨، بيروت.
٨١. الخالدى: صلاح عبدالفتاح.
٨٢. خەلیفەکانی ڕاشدین لەنێوان جێنشینبوونء شەهید بوون، وەرطێرانی فاتح سەنطاوی، هەولێر، ٢٠٠٢.

٨٣. الخربوطلى: على حسن.
٨٤. تاريخ العراق فى ظل حكم الاموى، ط٢، مصر، ١٩٥٩.
٨٥. غروب الخلافة الاسلامية، بيروت، ١٩٧٨.
٨٦. عشرة ثورات فى الاسلام، بيروت، ١٩٨٧.
٨٧. خالد عبد المنعم.
٨٨. ظهور الخوارج، موسوعة العراق الحديث، بغداد، ١٩٨١.
٨٩. الديوضى: سعيد.
٩٠. تاريخ الموصل، بغداد، ١٩٨٢.
٩١. اليزيدية، دار الكتب الموصل.
٩٢. زرار صديق توفيق.
٩٣. الكرد فى العصر العباسى، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٤.
٩٤. زبير بيلال اسماعيل.
٩٥. الاكراد فى كتب البلدانين ورحالة المسلمين، اربيل، ١٩٨٩.
٩٦. سيد قطب.
٩٧. الخطاب والايدولوجيا، ط١، دار الطليعة، بيروت، ١٩٨٧.
٩٨. السلمان : عبد الماجود احمد.
٩٩. الموصل فى العهدين الراشدى والاموى، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة موصل، ١٩٨٥.
١٠٠.صبحى صالح.
١٠١.النظم الاسلامية، ط٢، لبنان، ١٩٢.
١٠٢. صائب عبد الحميد.
١٠٣. تاريخ الاسلامى الاسياسى والثقافى والسياسى مسار الاسلام بعد الرسول، ط٢، ١٩٩٨.
عبد المنعم الحسنى.
١٠٤. الفرق والجماعات والمذاهب والاحزاب والحركات الاسلامية، بيروت، ١٩٨٩.
عبد المنعم المغنى.
١٠٥. موسوعة الفرق والجماعات، بيروت، ١٩٨٩.
عبدالعزيز الدورى.
١٠٦. مقدمة تاريخ صدر الاسلام، بغداد. ١٩٤٩.

١٠٧. الجزور التاريخية للشعوبية.
عبدالطيف الطيباوى.
١٠٨. محاضرات فى تاريخ العرب والاسلام.
عزيز العظمة.
١٠٩. ابن خلدون، ط١، مطبعة التراث، ٢....
على الوردى.
١١٠.منطق ابن خلدون، ط١، قم، ١٩٩٧.
عمر ابو نصر.
١١١. الخوارج فى الاسلام، بيروت، ١٩٥٦.
فائزة محمد عزت.
١١٢. الكرد فى اقليم الجزية وشهرزور فى صدر الاسلام. رسالة غير منشورة، جامعة صلاح الدين، ١٩٩١.
فاروق عمر.
١١٣. تاريخ الخليج العربى فى عصور الاسلامية،
١١٤. طبيعة الدولة العباسية.
عدنان على الخراجي.
١١٥. حخركات المعارضة للخلافة الاموية، ط١، بغداد.
كوثر اسماعيل حسن.
١١٦. الحياة الاقتصادية والاجتماعية فى اقليم اذربايجان واران خلال القرنين الرابع والخامس الهجريين، جامعةصلاح الدين، ٢٠٠٢.
لبيد ابراهيم احمد.
١١٧. عصر النبوة والخلافة الراشدة، ط٢، ١٩٨٧.
لطيفة البكاوى.
١١٨. حركة الخوارج نشاتها وتطورها الى نهاية العصر الاموى، ط١، بيروت، ٢..١.
لويس غدرية وج. قنواتى.
١١٩. فلسفة الفكر الدينى بين الاسلام والمسيحية.
محمد امين ذكى.
١٢٠. تاريخ السليمانية وانحائها.
محمدجاسم حمادى.

١٢١. الجزيرة الفراتية والموصل دراسة فى تاريخ السياسى والادارى، بغداد، ١٩٧٧.

محمد صادق العرجون.

١٢٢. عثمان بن عفان، ط٢، دار النهضة، ١٩٨٩.

محمد الطحان.

١٢٣. تيسير المصطلح الحديث، كويت، ١٩٨٦.

محمد عمارة.

١٢٤. الخلافة ونشاة الاحزاب الاسلامية، بغداد، ١٩٨٤.

١٢٥. محمد عبد الرحمان مرحبا.

١٢٦. من الفلسفة اليونانية الى الفلسفة الاسلامية، ط٢، بيروت، ١٩٨٣.

محمد على ابوريان.

١٢٧. تاريخ الفكر الفلسفى فى الاسلام، ط٢، بيروت، ١٩٨٩.

محمد عبداللة عودة واخرون.

١٢٨. مختصر التاريخ الاسلامى، ط١، عمان، ١٩٨٩.

محمد محمد صالح.

١٢٩. تاريخ اوروبا عصر النهضة و حتى الثورة فرنسية، بغداد، ١٩٨١.

محمد نصر مهنا.

١٣٠. علم السياسة، ط٢، القاهرة، ١٩٨٩.

مطاع الصفدى.

١٣١. استراتيجية التسمية، دارالبيان، بغداد، ١٩٨٦.

نايف معروف.

١٣٢. الخوارج فى عهد الاموى نشاتهم وتاريخهم عقائدهم ادبهم، ط٤، بيروت، ١٩٩٤.

النقشبندى: حسام الدين على غالب النقشبندى.

١٣٣. الكرد فى الدينور وشهرزور، خلال قرنين الرابع والخامس، جامعة بغداد، ١٩٨٥.

نورى جعفر.

١٣٤. الصراع بين الامويين ومبادى الاسلام.

نيكيتا ايليسيف.

١٣٥. الشرق الاسلامى فى عصر الوسيط.

١٣٦. دائرة المعارف الاسلامية، ط٢، القاهرة، ١٩٦٩. مادة شهرزور، مج ١٣، مينورسكى.

## سەرچاوە کوردی و فارسیەکان


ئارشناك پۆلادیان.

٨٨. کورد لە سەرچاوە عەرەبیەکاندا، و، ئاواد عوبێد، هەولێر.

حەسەن ئەرفەع.

٨٩. کوردەکان، وەرگێڕانی سەردار موحەمەد، سلیمانی، ٢٠٠٠.

حسن پیر نیا واقبال اشتیانی.

٩٠. تاریخ ایران از اغاز تا انقراض ساسانیان، جلد اول، چاپ دوم، تهران.

ڕێبین ڕەسوڵ ابراهیم.

٩١. سیستەمی سیاسیو هزرو فەلسەفەی سیاسی، چاپی یەکەم، سەردەم، ٢٠٠٣.

ڕەشاد میران.

٩٢. ڕەوشی ئایینیو نەتەوەی لە کوردستان.

سەرهەنگ عەبدولواحد.

٩٣. کوردو نیشتمانەکەیان.

شوان عوسمان مستەفا.

٩٤. کوردستانو پرۆسەی بە ئیسلامکردنی کورد.

عبد الحسین زرین کوب.

٩٥. دوقرن سکوت، سرگذشت حوادث واوضاع ایران، چاپ اول، تهران، ١٣٧٨.

عەتا قەرەداخی.

٩٦. کاریگەری کەلتوری ئەوان لەسەر کورد، سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.

فوئاد مەجید میسری.

٩٧. بیری ئوسولی ئیسلامی، چاپی یەکەم، ٢٠٠٣.

کورت فریشلر.

٩٨. گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی ئیسلام، وەرگێڕانی حەمەی حەمە سەعید،سلیمانی، ٢٠٠٣.

محمد ئەمین زەکی.

٩٩. کورتەی کوردو کوردستان، چاپخانەی دار السلامی بەغداد.

مخدوم: منصور.

۱۰۰. اهمیت کردو کردستان  در ادوار تاریخ ایران، کتابخانه ملی ایران، چاپ تهران، ۱۳۸۲ هجری قمری.
ایت الله مردوخ.
۱۰۱. تاریخ کرد کردستان، انتشارات غریقی، تهران، ۱۳۵۱
مصلح مصطفی جلالی.
۱۰۲. شوراتەکان، مطبعة بغداد، ١٩٨٦.
هاشم معروف الحسنی.
۱۰۳. شیعه در برابر معتزله واشاعره، چاپ سوم، شیراز، ۱۳۷۹ هجری قمری.
هەمەوەندی: تارق حەسەن.
۱۰٤. پوختەی فیقهی شەریعەت بەبەلگەی قورئان‌و سوننەت.
هاملتون جب.
۱۰۵. اسلام بررسی تاریخ.
بورهان محمد ئەمین.
۱۰٦. تەفسیری ئاسان بۆ تێگەیشتنی قورئان، هەولێر، ۲۰۰۲.

چوارەم: گۆڤارە عەرەبییەکان.

سالم الشريره.
١,٧ من مشاهير المفسرين، مجلة الرسالة الاسلامية، عدد ٢٥٧.
عبداللة حماد.
١٠٨ التفكير والهجرة فى فكر الخوارج، مجلة النهج، العدد، ٢٧، ٢..١.
قحطان عبد الستار الحديثي.
١٠٩. حركات الخوارج فى خراسان، مجلة الاداب، العدد ٦، ١٩٧٤.
حسام الدين النقشبندى.
١١٠. ديانه الكرد القديم، گۆڤاری هەزارمێرد، سلێمانی، ٢٠٠٢.

پێنجەم: گۆڤارە کوردیەکان.

بەهمەن گاهر نەریمان.
١١١. گۆڤاری ژیار، ژمارە ١، هەولێر ٢....
شوکر مستەفا.
١١٢. بیروباوەڕی کوردەواری، گۆڤاری ڕامان، ژمارە ٦٥، هەولێر ٢..١.
عبدالله خلیفه.
١١٣. ڕەگو ڕیشەی توندو تیژی لە ژیانی هاوچەرخی عەرەبیدا، گۆڤاری ڕوانگەو ڕەخنە، وەرگێڕانی نەجم عەبدوللآ، ژمارە ٤- ٥، سلێمانی.
محمد جەمیل ڕۆژ بەیانی.
١١٤. خانەقین لە مێژوودا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، ژمارە ١٨- ١٩، بەغداد، ١٩٨٨.
کامەران بابا زادە.
١١٥. گۆڤاری ڕابوون، ژمارە ٣، سلێمانی، ١٩٩٩

# Kurd and movement of Khawarige

Majid khalil

2010



لە بلاوکراوەکانی خانەی چاپ و بلاوکردنەوەی چوارچرا